پرۆژەی تیشك

٣

# ئاشتینـــامـه

## وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی

ئامینە صدیق عەبدولعەزیز
( دایکی نور )




# ئاشتینامە

## وەڵامێك بۆ ( خوێننـامە )ی زەردەشتی

**ئامینە صدیق عەبدولعەزیز**

**( دایكی نور )**

چاپی یەكەم
٢٠٠٦زاییینی ـ ١٤٢٧ كۆچی

ئاشتینامه

ناوی کتێب: ئاشتینامه وەلاْمێك بۆ خوێننامەی زەردەشتی
نووسەر: ئامینه صدیق عەبدولعەزیز (دایکی نور)
نۆرەی چاپ: یەکەم
ژمارە سپاردن: ٣٩٨ ساڵی ٢٠٠٦
تیراژ: ٢٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٠٦
چاپخانه: چوارچرا

ناوەڕۆك

### بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

دەزانین زۆر ناوهێنانی هەرکەسێك با نەناسراوو بێکەڵکیش بێت ناوداریدەکات، بەڵام گەر ناودەرکردنەکەی لە چاکەدا نەبێت، لە ڕاستیدا ناوزڕاویە نەك ناوبانگی ڕێزداری. دیارە کەسێك کە هەڵەیەکی ناقۆڵای کرد، تا زۆرترین وەڵامی بدرێتەوە، کەموکورتی زیاتر دەردەکەوێت‌و پێی بچوك دەبێتەوە نەك بە پێچەوانەوە. بۆیە جێگەی شانازی نابێت بۆ مەریوان هەڵەبجەیی، کە ئەم بەرهەمەش وەك (نەزانیی‌و بێشەرمیی) بۆ دەمکوتی (خوێننامە)ی ئەو بێت کە بەناوی خوازراوی (زەردەشتی)یەوە بۆیان بڵاوکردەوە، گوایە لە ستۆکهۆڵم نووسیویەتی!

سەبارەت بە کتێبی (خوێننامە)ش، ئەوەی ئاشنای نەخوێندەواری زەردەشتی بێت، دەزانێت ئەو (٧٨) سەرچاوەیەی لە کۆتایی کتێبەکەیدا ڕیزی کردون، گوایە خوێندونیەوەو بۆ نووسینەکەی سوودی لێبینیون، زۆرینەی ئەو سەرچاوانەی نەدیون چ جای خوێندنەوە، بەڵکو لە چەند کتێبێك بە ناوی خۆیەوە نەقڵی کردوون‌و ئەمانەتیشی نەپاراستووە کە ناویان بهێنێت.

کتێبی (ئاشتینامە) وەڵامێکی بابەتیانەو پوختی (خوێننامە)یە لەلایەن (ئامینە صدیق)ەوە نووسراوە کە ئافرەتێکی شارەزاو خوێندەوارو قەڵەمێکی بە ئەزموون‌و بە توانایە، هیوادارین ئەم بەرهەمەش وەکو هەردوو بەرهەمی پێشتووترمان جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران بێت، دەخوازین هاندەریش بێت بۆ ئافرەتانی ڕۆشنبیر تا چاو لە ئامینە خان بکەن‌و ئەوانیش بەشداریمان بکەن، بە تایبەت کە دەبینین ئەمڕۆ بە ناوی بەرگری لە ئافرەت‌و مافەکانیان پەلاماری ئاایینی ئیسلام دەدرێت.

لە کۆتایدا لەگەڵ سوپاسی زۆرمان بۆ سەرجەم ئەو نووسەرو ڕۆشنبیرانەی کە بەدەنگمانەوە دێن‌و بەشداریمان دەکەن، ئەوەش دووپات دەکەینەوە کە بەرهەمەکانیان زادەی بیرو توانای زانستی نووسەری بەرهەمەکانەو تەعبیر لە ڕای ئەوان دەکەن نەك پرۆژەی تیشك.

**پرۆژەی تیشك**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سەرەتايەكی پێویست

ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەوەتەی هاتووە تا ئێستە هەر وەك چۆن شوێنكەوتوانی نەوە لە دوای نەوە زیاتر شەیدای دەبن و گەورەییان بۆ دەردەكەوێت، نەیاران و ناحەزانیشی لە هەموو چەرخ و زەمەنێكدا هەوڵی خامۆشكردن و كوژاندنەوەی ئەو چرا خواییەیان داوە. زۆرتر بە زەبرو خوێنڕشتن و كەمتر بەنووسین، بەڵام ئەوەندەی خوا ویستبێتی بۆ تاقیكردنەوەی خواناسان درێژەی كێشاوەو ڕەنجی خوانەناسان بە فیڕۆ چووەو خۆیان و بەرهەمی هەوڵەكانیان چوونەتە ناو لاپەڕە ڕەشەكانی مێژووەو نوری خوا كە قورئان و فەرموودەیە وەك خۆی و ڕوونتر لە جاران ماوەتەوە " سوپاس بۆ خوا".

لەم سەردەمەشدا كەسانێكی وەك (زەردەشتی) بە هەمان قەوانی كۆن و هەوڵی ڕابردوو دەیانەوێت بە زمانێكی تازەو بەرگێكی تازەوە نوزەیەكی بكەنەوە بە گیاندا، بەڵام تەنها خەیاڵە، چونكە نوری خوا بە فووی دەمی ئەوان ناكوژێتەوە. خوا خۆیشی دەفەرموێت:(يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) (الصف: ٨).

زۆر سەیرە لە مێژووی كۆن و نوێ و ئێستەشی لەگەڵدا بێت كەم بیستراوە كەسێكی خاوەن پلەی باڵا لە زانست ڕەخنە لە ئایینی ئیسلام بگرن نەك هەر ڕەخنەیان نەگرتوە، بەڵكو بەچاوی ڕێزەوە سەیریان كردوەو پاش دیراسەكردن ستایشیان كردووە.

زۆرێك لەوانە مێژوو قسەكانی تۆمار كردوون، زۆربوونی ژمارەی موسڵمانان لەوڵاتە بیانییەكان و لە ناو چینی خوێندەوارو زانایانی زانستە جۆراوجۆرەكاندا شایەتن لەسەر ڕاستی و گەورەیی ئیسلام و لەسەر گونجانی ئیسلام لەگەڵ سەردەمی نوێدا.

كەسانێكی كۆلكە خوێندەواریش كە تفەنگ بە تاریكییەوە دەنێن و تەنهاو بەتەنها خۆیان زیان دەكەن، ئەگینا ئیسلام وەك خۆی دەمێنی و موسڵمانەكانیش وەك چۆن خوا فەرمانی پێكردوون لەسەر چاو ڕۆشنی شوێن ئیسلام بكەون و هەمیشە بخوێننەوەو هەوڵی فێربوون بدەن، پاش نووسینی هەر شتێك دژ بە ئیسلام زیاتر دەخوێننەوەو زیاتر فێر دەبن و زیاتر باوەش دەگرنەوە بۆ ئیسلام.

من لە كاتی خوێندنەوەی (خوێننامە)دا ئەوەندەی بەزەییم بەنووسەرەكەیدا هاتەوە كە بۆ مەرامێكی دونیایی ڕاستییەكان لە خۆیشی و خەڵكیش دەشێوێنێت, ئەوەندەش دڵگران بووم خوێنەرانی میللەتەكەم چەواشە بكرێن و گاڵتە بە عەقڵیان بكرێت.

بۆیە بە پشتیوانی خوای گەورە دەستمدایە وەڵامدانەوەی.

هەڵسەنگاندنی خوێننامەو خاوەنەكەی

خوێنەری بەڕێز:

١. (خوێننامە) نووسینێكی پڕ لە چەواشەكارییەو دوورە لە هەموو شێوازێكی لێكۆڵینەوە.

٢. نووسینێكی ئەكادیمی نییەو خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم وەڵامەدا بۆی دەردەكەوێت چ ناوێكی لێبنرێت باشە.

٣. پڕە لە هەڵەی وەرگێڕان و نەقڵ و پڕە لە قسەی چنراو هەڵبەستراو، سەمەرەش لەوەدایە هەندێ جار دەیداتە پاڵ كەسانی تریش.

٤ . نووسەر :

أ . مرۆڤێكی بێئاگایە لە ئیسلام.

ب . زمانی عەرەبی بە باشی نازانێت.

ج . درۆی بەدەم نووسەرانی ترەوە كردووە.

٥. تەنها ئەوەی دروست بێت لەم نووسینەدا ناوەكەیەتی (خوێننامە)، بەڕاستی خوێن نامەیە، چونكە پاش ئەو هەموو ناحەقییانە دەربارەی ئیسلام و سەرچاوەكانی كردوویەتی لەبەرگەكەیدا نوسیوویەتی:

" پێشکەشە بەو ڕوناکبیرو سیاسیو حیزبانەی کە پێیانوایە دەکرێت لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا دیالۆگ بکەینو لە کۆمەڵگایەکی مەدەنیدا پێکەوە بژین". خوێن نامە، بەرگ.

ئەو قسەیە بۆنی خوێنی لێدێت، نەك قورئان کە سەرانسەری ڕەحمەت و خۆشگوزەرانی بووە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە ئایینە جۆراو جۆرەکانو واقیعی دەسەڵاتی ئیسلامیش ئەوەی سەلماندووە, کەسی زۆری لێنەکراوە بۆ هاتنە ناو ئایین و مەشخەڵی کۆمەڵگای ئیسلامیش (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) بووە.

خوێنەری بەڕێز ڕاستیو دروستی ئەم هەڵسەنگاندنەت لە خوێندنەوەی (خوێننامە)و وەڵامەکەیدا بۆ دەردەکەوێت.

بۆ ئاسانکاری لە سەر خوێنەری بەڕێز نوسینەکەی (زەردەشتی) نەقڵ دەکەم پاشان وەڵامی دەدەمەوە.

لەم بەشەدا " لاپەڕە پێنج بۆ لاپەڕە شەستو هەشت"ی (خوێننامە) نووسەر هەوڵیداوە چەند گومانێك دەربارەی خودی قورئان دروست بكات.

فەرموون ئێوەو هەڵەو گومانەكانی (زەردەشتی)و ڕاستكردنەوەی هەڵەكانو ڕەواندنەوەی گومانەكانیش.

١. لەلاپەڕە (٧)دا لە پەراوێزدا دەربارەی سورەتی (العلق) دەڵێت" لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك پێیان وایە كە سوورەتی (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ) یەكەم ئایەتەو ئایەتەكانی سورەتی (العلق) گفتوگۆی نێوان خواو پەیامبەر بووە، نەك ئایەت بڕوانە: ابن كثیر .. تفسیر القران الكریم .. ج١ص٩".

كاتێك سەیری ئەو سەرچاوەیەم كرد دەبینم پێچەوانەی ئەوەیە كە نووسەر نقڵی كردووە. هەمان لاپەڕەی (زەردەشتی) درۆی بەدەمەوە دەكات حەزدەكەم بۆ دڵنیای خوێنەران هەروەك نووسینەكەی خۆی بینووسمەوە پاشان تەرجەمەی بكەم: " فأول شيء نزل من القران هذة الايات الكريمات المباركات، وهن أول رحمة رحم الله بها العباد" ص٩ج١تفسير القران الكريم .. ابن كثير.

ئیبن كثیر دەڵێت:" یەكەم شتێك لە قورئان دابەزی بێت ئەم ئایەتە بەڕێزە موبارەكانە بوون، ئەم ئایەتانە یەكەم بەزەیی خوایی بوون ڕشتی بەسەر بەندەكانیدا.. " تەفسیری سورەتی (العلق)".

نازانم بۆچی (زەردەشتی) دەیەوێت گومان دەربارەی سورەتێكی وەك (العلق) دروست بكاتو درۆ بەدەم زانایەكی وەك (ابن كثیر)ەوە بكات كە دەزانێت ئەو نووسەرە بەڕێزە جێگەی متمانەی موسڵمانانە.

ئایا لەبەر ئەوەیە كە مایەی شانازییە بۆ موسڵمانان. كە یەكەم سورەتێك دابەزیووە داوای خوێندنو خوێندەواری دەكاتو باس لە هۆكاری فێربوونەكەشی دەكات كە قەڵەمەو باس لەوەش دەكات كە مرۆڤ بوونەوەرێكی ئامادەكراوە بۆ فێربوون.

٢. زەردەشتی لە لاپەڕە (٨)دا دەڵێت:" سەرەتاكانی نووسینەوەی ئایەتەكان لە لایەن پەیامبەرەوە خۆی بووە.. ئەو ڕایەی كەدەڵێت پەیامبەر خوێندەواری نەبووە ڕایەكی كۆنە، چونكە بە پێی دەقو سەرچاوەكان پەیامبەر توانیوێتی بخوێنێتەوەو بنووسێت." ئەوجا ژمارە (١٤)ی لێدەداو لە پەراوێزدا دەڵێت:" سەیری ئایەتی الاعراف ١٥٨ بكە".

ئەوە گرنگ نییە وتویەتی، "ئایەتی الاعراف ١٥٨" كە دەبوو بیوتایە سورەتی الاعراف ئایەتی ١٥٨، بەڵام ئەوە جێگەی سەرنجو شەرمەزارییە كاتێك خوێنەر دەچێتە سەر ئایەتەكە نەئایەتی ١٥٨و نە١٥٧و ١٥٩و نە هەموو سورەتەكە ئەو باسەی (زەردەشتی) تێدانییە, بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر فەرموون ئێوەو ئایەتەكە كە پێچەوانەی قسەكانی زەردەشتییە:

(قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (الأعراف: ١٥٨)

لەئایەتەكەدا وەسفی پەیامبەر بە (أمی) دەكات، لە هەموو تەفسیرەكاندا (أمی) بە نەخوێندەوار تەفسیر كراوە، نەك هەر تەفسیرەكان سەیر هەموو قاموسەكانیش بكە وا دەڵێن.

بۆ نموونە لە "المنجد فی اللغة والاعلام" چاپی ٢٣ لاپەڕە ١٧ دا دەڵێت: " (الأمي): من لايعرف الكتابة ولا قرأة"، ئیتر نازانم نووسەر ئەوەندە كەم زانیارییە یان دەزانێتو بەمەبەستێك گاڵتە بە عەقڵی خوێنەر دەكاتو وادەزانێت ئەگەر هەر لە خۆیەوە ژمارە ڕیز بكات یان ناوی سەرچاوە ببات خەڵكی باوەڕ دەكەنو ناگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەكان.

٣. (زەردەشتی) لە هەمان لاپەڕەی پێشوو، لاپەڕە (٩)و لاپەڕە (١٠)دا چەند قسەو بەڵگەیەكی لاواز دەهێنێتەوەو دەیەوێت بیسەلمێنێت كە پەیامبەر ﷺخوێندەوار بووەو خۆی قورئانی نووسیوەتەوە:

خوینەری بەڕێز خوای گەورە دەفەرمووێت : "هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ..".

لە سورەتی (العنكبوت: ٤٨)دا دەفەرموێت: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ)، پەیامبەر خۆیشی دەفەرمووێت:" أنا أمة أمية، لا نكتب ولا نحسب" بوخاری ڕیوایەتی كردووە.

هەرچی بەڵگە هەیە لە سەر نەخوێندەواری پەیامبەر ﷺ هەمووی بەڵگەی (قطعی)ین‌و بەڵگەکانی تر بەڵگەی (ظنی)ین‌و لە کاتی نەگونجانی ئەو دوو جۆرە لە بەڵگەدا بێگومان ئیش بە بەڵگە (قطعی)یەکان دەکرێت‌و ئەوانی تر پشتگوێ دەخرێن، بەڵام نووسەری (خوێننامە) ئەمەی نەزانیوە.

پاشان ئەو فەرمودەیەی دەربارەی پەیمانی حودەیبییە هاتووە واتای ئەوە نییە پەیامبەر خۆی بەدەستی خۆی نووسیبێتی، بەڵکو فەرمانی بەنووسینی کردووە.

وەك دەڵێن فلانە سەرۆك نووسی بۆ فیسارە سەرۆك، واتای ئەوەی نییە خۆی بە دەستی خۆی نووسیبێتی، بەڵکو بیسەر یەکسەر تێدەگات کە ئەو سەرۆکە نووسەری هەیە، نامەکان یان بەندەکانی پەیمانەکەی بۆ دەنووسێت، مێژووش شایەتە لەسەر ئەوەی کەموحەممەد، پەیامبەر ﷺ چەندەها نووسەری هەبووەو (زەردەشتی)یش نکوڵی لە بوونی ئەو نووسەرە بەڕێزانەی پەیامبەر ﷺ ناکات.

٤. لە لاپەرە ١٣.١٢دا دەڵێت: "دوژمنی سەرسەختی ئیسلام (معاویە بن أبی سفیان) پاش گرتنی مەککەو موسڵمان بوونی، پێش چەند مانگێك لە مردنی پەیامبەر دەبێتە کاتب وەحی".

موعاویە دوژمنی سەرسەختی ئیسلام نییە، بەڵکو شەرەفی هاوەڵێتی پەیامبەری دراوەتێ‌و پەیامبەریش ﷺ شایەتی چاکەی داوە بۆ هەموو هاوەڵانی‌و خوای گەورەش بەچاکە باسیان دەکات لە تەورات‌و ئینجیل‌و قورئانیشدا.

ئەو سەرچاوانەی تۆ ئەو قسەیەی لێ نەقڵ دەکەیت هەرگیز قسە بەسەنەدەوە ناگێڕێتەوەو نەیاری موعاویەن‌و ئەگەر دژایەتی موعاویە دەکەن لەسەر ئەهل‌و بەیتی پەیامبەر، خۆ کەسێکی وەك کچەزای پەیامبەر ﷺ حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بەیعەتی بە موعاویە داوە.

خۆ ئەگەر کەمێك واقیعییانە سەیری مێژووی تازەی خۆیشمان بکەین، دەبینین کەسانی زۆر چاکەکارو شۆڕشگێڕ هەن ئەگەر چاکەکانیان بنووسرێت خەریکە بڵێم نایەتە ئەژمار، بەڵام نەیارێکی ئەو شۆڕشگێڕە دێت‌و بەوردبین هەڵەکانی گەورە دەکات نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تۆمەتیشی بۆ دروست دەکات.

ئێ هیچ مرۆڤێکیش جگە لە پەیامبەران بێتاوان‌و بێ هەڵە نییە, ئایا ئەبێت تۆ شایەتی نەیارێکی موعاویە وەربگریت‌و شایەتی خواو پەیامبەر وەلا بنێیت.

٥. لە لاپەڕە (١٦)دا دەڵێت:" هەرچەندە ڕیوایەت لە سەر کۆکردنەوەی قورئان هەتا بڵێی زۆرە، بەڵام کۆی هەمووی زیاتر پشت بەمە دەبەستێت کە ئێمە نووسیمان، ئەمەش بۆ ئێمە جێی سەرنج نییە، چونکە سەرنجەکان لەوێوە دەست پێدەکات کە لە دوای کۆکردنەوەی قورئان ڕیوایەتگەلێکی زۆر باسی دەستکاری قورئان دەکەن‌و.."

بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەی چەند ڕستیەکی تر دەهۆنێتەوە لەوانە: لە لاپەڕە (١٧)دا دەڵێت "ئاماژەمان بە ئارەزووەکانی پەیامبەردا لە دانانی ئایەتەکان، سرووشت‌و ئایەتەکانی پاش‌و پێش خستووە".

کاکی (زەردەشتی) بۆچی ئەو هەموو ڕیوایەتە سەحیحە لەسەر کۆکردنەوەی قورئان جێگەی سەرنجی تۆ نییە؟! ئەی کام ڕیوایەتە سەحیحە باسی دەستکاری قورئانی کردووە؟!

پەیامبەر ﷺ خوا شایەتی ئەوەی بۆ داوە کە هیچی بە ئارەزووی خۆی نەفەرمووە. "وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى. إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى"، موحەممەد بە ئارەزووی خۆی هیچ ناڵێت، بەڵکو فەرموودەکانی هەمووی سرووشتی خواییە". دانانی ئایەتەکان‌و پاش‌و پێشخستنیان بەکۆی دەنگی زانایان لەلایەن خواوە بووە، ئەم قورئانەی بەردەستمان بەو شێوەیە لە "لوح المحفوظ"دا نووسراوە.

سەنەدی (یەك ڕایی) زانایان لەسەر ئەمە چەندەها دەقی سەحیحە لەوانە:

ئیمامی ئەحمەد لە عوسمانی کوڕی ئەبی عاسەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت" لە خزمەت پەیامبەر دا دانیشتبووم کاتێکمزانی کەمێك نیگای گۆڕاو پاشان ئاسایی بوویەوەو فەرمووی: " أتاني جبريل فأمرني ان اضع هذة الاية هذا الموضع من السورة، (ان الله يأمركم بالعدل والاحسان وايتاء ذى القربى) " النمل ٩٠ الى اخرها.

واته: "جبریل هات‌و فەرمانی پێکردم ئەم ئایەتە بخەمە ئەم جێگەیە لەو سوورەتەدا"، پاشان لە چەندەها فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پەیامبەرﷺ چەندەها سوورەتی بە تەواوی لە نوێژەکاندا خوێندووەو ساڵانەش ئەوەی دابەزی بێت لە ڕەمەزاندا جبریل بە تەواوی دەیخوێندەوە بۆ پەیامبەرو پەیامبەریش بە هەمان خوێندنەوەی جبریل بۆ هاوەڵانی دەخوێندەوەو هاوەڵانیش لای هەندێ لە هاوەڵان، پەیامبەرﷺ چەند نووسەرێکی تایبەتی هەبووە بۆ نووسینەوەی قورئان ئەوانیش بەو شێوەیەی پەیامبەرﷺ دەیخوێندەوە ئایەت‌و سوورەتەکانیان ڕیز دەکرد.

ئەگەر تۆش لە هەر کونە قەیدێك ئەم قسانەت هێناوە ئەوا دەدرێتەوە بەسەر تۆو خاوەنی قسەکەدا، چونکە پێچەوانەی دەقی ئایەت‌و فەرموودەی سەحیحە.

٦. لە لاپەڕە (٢٣دا دەڵێت: "دەبێ ئەوەش بڵێین کە مەسحەفە ئەسڵەکەی (عەلی)ی شاردراوەتەوەو دیارنییە.." ئەم مەسحەفە هەتا سەدەی بیستیش خەڵکی دەیانبینی.

ئەگەر ڕاست دەکەیت بۆ ناڵێیت کێ شادیەوەو بۆچی شاردراوەتەوە؟ ئەوەی ڕاستە ئەوەیەکە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب تا سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان مەسحەفی تایبەتی خۆی هەبووە، وەك هەموو نووسەرەکانی تری قورئان، بەڵام پاش نووسینەوەی قورئان، کردنی بەیەك مەسحەف‌و لەبەرگرتنەوەی ئەو مەسحەفەو ناردنی بەوڵاتەکاندا، ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد هەموو مەسحەفەکانی تر بسووتێنن‌و هەموو قورئانخوێنێك پشت بەو مەسحەفە ببەستێت‌و ئەوە بخوێنێتەوە.

ئەم کارە پیرۆزەی ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت چەندەها حیکمەتی تێدابوو، لەوانە بۆ ئەوەی هەر کەسێك قورئانێکی کاملی لابێت ئەوەی کە خۆی فریای نووسینی نەکەوتبێت یان لە کاتی دابەزینی هەندێ ئایەتدا ئامادە نەبوو بێت ئەوانەش بنووسێت، یان ئەگەر واتای ئایەت یان تەفسیرێکی پەیامبەری نووسی بێت لێی نەبێت بە ئایەت.

عوسمانی کوڕی عەففان ئەم کارە گەورەی کرد کەچەندەها قسەی وەك ئەم پڕوپاگەندانە بەتاڵ دەکاتەوە.

کاتێك باس لە مەسحەفەکانی ناو مۆزەخانەکان دەکەیت[1]. ئەو مەسحەفانە گومانیان لێدەکرێت کە مەسحەفی کاتی خەلیفە عوسمان بن، چونکە خاڵنەخشی نێوان سوورەتەکان‌و جوانکاری تێدا کراوە کە بێگومان لە کاتی خەلیفە عوسماندا بەو شێوەیە نەنووسراوە[2].

٧. لە لاپەڕە (٢٤) بۆ (٣٥) (زەردەشتی) ناوی کۆمەڵێك مەصحەف دەبات‌و ناوی هەندێ هاوەڵ دەخاتە سەری, ناوی هەندێ لەو هاوەڵانە ڕاستن کە خاوەنی مەسحەف بوون، بەڵام مەسحەفەکانیان تا کاتی مەسحەفەکەی عوسمانی کوڕی عەففان ماون‌و پاشان هەموویان سووتێنران، ئیتر پاش ئەوە نەبیستراوە یەکێك لە هاوەڵان‌و تابیعییەکان لە مەسحەفەکەی عوسمان لای دابێت یان ڕایەکی جیاوازو نەگونجاوی هەبووبێت.

٨. لە لاپەڕە ٣٦دا پاش ئەوەی باس لەوە دەکات کە مێژووی ئیسلام هەمووی بەسەنەد تۆماکراوە پاشان دەڵێت: "هەربۆیە باوەڕبوون بەو تێگەیشتنەی کە ئێمە هەمانە بەرانبەر بە مێژووی ئیسلام وامان لێدەکات بەهەمان شێوە باوەڕمان بەم ڕیوایەتانە هەبێت، خۆ ئەگەر گومانمان لەم ڕیوایەتانەیان هەبێت دەبێت گومانمان لە تەواوی گێڕانەوەیان هەبێت، ئەم گومانەش هەموو مێژووی ئیسلام دەگرێتەوە!".

بەڕاستی ئەم هاوکێشەیە زۆر نامەنتیقی‌و منداڵانەیە، بە تایبەت کە خۆی لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: "گومان لەوە ناکرێت کە مێژوونوسان زیادەیان خستبێتە سەر یان یاخود کەمیان نووسیبێت..، چونکە ڕووداوەکان بەپێی سەنەدەکان تۆمارکراون‌و لە چەندین بەرهەم‌و نووسینی مێژوونوسانەوە بۆ چەند جارێك گێڕدراونەتەوەو نووسراونەتەوە".

بەڵێ، ئەوەی تۆش شایەتی بۆ دەدەیت مایەی شانازی موسڵمانەکانە کە بە سەنەدەوەو بەو تۆکمەییە مێژوومان نوسراووەتەوە.

---

[1] ل١٧ خوێننامە.

[2] ل ٣٧٣ مناهل العرفان فی علوم القران ج١.

بەڵام کە ئێمەش‌و تۆش گومانمان لەوانە نییە نابێت ئەمە وامان لێبکات ئیتر گومان لە هیچی تر نەکەین. یان ئەگەر گومانمان لە شتی تر هەبوو دەبێت گومان لە شتە موسەلەمەکانیش بکەین، چونکە دیارە لە هەموو سەردەمێکدا کۆلکە نووسەرو چەواشەکار هەبوون نووسیویانەو هەموو ڕایەکیش ڕای بەرانبەری هەیەو بۆی بنووسێت، بەڵام ئەوەش حەقیقەتە کە ئەگەر ڕایەك ڕاست دەرچوو دیارە بەرانبەرەکەی درۆیە.

تۆ ئەگەر مێژووی پاکی ئیسلامت بۆ دەرکەوتووەو ئەمانەتپارێزی هاوەڵان (أصحاب) دەزانیت، دەبێت ئەوەش بزانێت پێچەوانەی ئەو پاکی‌و ئەمانەت پارێزییە گڵاوی‌و خیانەتکارییە.

٩. لە لاپەڕە (٣٧) تا (٤٠) باسی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) دەکات‌و جیاوازی ڕای زانایان دەهێنێت دەربارەی ئەوەی ئایا ئایەتە یان نا؟! پاشان دەڵێت:" جا ئەمە حاڵی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) بێت، داخۆ بۆ باقی ئایەتەکان دەبێ چی گوترابێت‌و چی بیسترابێت؟!!"

خوێنەری بەڕێز: سابت بووە کە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لە هەر شوێنێکی قورئاندا هاتبێت ئەوە لە قورئان دەژمێردرێت‌و ئایەتێکیشە لە سورەتی "النمل"[1].

ئەو ڕیوایەتانەی تۆ باست لێوە کردوون کە گوایە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لەکاتی پەیامبەرو هاوەڵەکانیدا نەخوێندراوە، زانایان دەریانخستووە کە نابن بە بەڵگەو هەریەکەیان بەیەکێك لە یاساکانی وەرگرتنی فەرموودە لەکارخراون. ئیتر چ گرفتێك لەمەدا هەیە کە (زەردەشتی) سەری لەبەر دەرنەکردووە پاشان کە (زەردەشتی) دەڵێت ئاخۆ چی دەربارەی ئایەتەکانی تر چی گوترابێت؟!! من بێگومانم لەوەی هەرچی گوترابایە باسی دەکردو درێغی نەدەکرد.

١٠. لە کۆتایی هەموو گومانە بێ بناغەکانیدا (زەردەشتی) لە لاپەڕە ٣٩دا دەڵێت:" ئەمە بەشێکە لە مێژووی ئیسلام‌و تەنها دەیکەینە کوردی‌و ڕاست‌و ناڕاستی پەیوەندی بە ئێمەوە نییەو خوێنەریش ئازادە لە قبوڵکردنیدا یان ڕەتکردنەوە.. گرنگ ئەوەیە ئێمە جگە لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئیسلام پشت بە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نابەستین".

ئایا پەڕاوەکانی (ئیسلام ناسی) (رکبت السفينة)و ( جەهالەتی ئیسلام)و (الاسلام ضد الاسلام)، سەرچاوەی ڕەسەنی ئیسلامن؟!!.

ئەگەر باسی هەندێ سەرچاوەی موعتەبەریشت کردووە کاتێك خوێنەر دەگەڕێتەوە سەریان‌و سەیریان دەکات، یان هەر ئەو باسەی تۆی تێدا نییە، یان ئەگەر تیایدا بێت بۆ موناقەشەکردن‌و ڕوونکردنەوەی باسکراوەو چارەسەرکراوەو ڕاست‌و ناڕاستیەکەی ڕوونکراوەتەوە.

ئەگەر تۆش وەرگێڕی پەڕاوەکانی ئەوا بە ئەمانەتەوە وەریگێڕەو خەڵکی چەواشە مەکە. ئەگەریش خاوەنی ئەو فکرەیەیت لە مەسئولیەتی نووسینەکەت ڕامەکەو مەیخەرە ئەستۆی کەسانی تر, کە بێگومان ئەگەر زیندوبوونایە دەرگای دادگایان لێدەگرتیت لەسەر ئەو ناحەقییانەی کە پێیان دەکەیت.

زۆربەی ئەوانەی تۆ لێیان دەگێڕیتەوەو بە دەمیانەوە دەڵێیت لە ژیاندا نەماون‌و تا لە ژیانیشدا بوون کۆششیان بۆ ئەوە کردوە زانستەکانی ئیسلام بەپارێزراوی بمێننەوە.

لە لاپەڕە (٤٠) تا لاپەڕە (٦٨)ی (خوێننامە) باس لەوە دەکات کە چەند سوورەتێك زیاد کراوە بۆ قورئان‌و چەند سوورەتێك کەم کراوەتەوەو چەند ئایەتێك بە هەمان شێوە کەمکراونەتەوەو چەند وشەیەك ئاڵوگۆڕی پێکراوە.

(زەردەشتی) بۆ سەلماندنی ئەم قسانەی چەند دەقێکی سەحیح‌و چەندەها قسەی هەڵبەستراوو دەقی غەیرە سەحیح دەهێنێت‌و دیارە سەری لەبەر دەرنەکردووە بۆیە ئاوا لێی تێکچووەو دەیەوێت بە ناهەق گومان لەسەر قورئان دروست بکات، کە کتێبێکە گومان هەڵناگرێت " ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ "، یەکێکیش لە موعجیزەکانی قورئان ئەوەیە کە ئەگەر لێی تێگەیشتی هۆکاری هیدایەت‌و ئەگەر لێی تێنەگەیشتی‌و دڵ‌و مێشکت بۆ نەکردەوە هۆکاری سەر لێتێکچوونە (پەنا بەخوا).

---

[1] ـ بداية المجتهد ونهاية المقتصد ج١ ص١٢٨.

"إِنَّ اللّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللّهُ بِهَذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ" (البقرة: ٢٦)".

بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، واتە نووسینی هەڵەو گومانەکانی (زەردەشتی)و بەتاڵ کردنەوەیان (بە ویستی خوا).

١١. زەردەشتی لە لاپەڕە (٤٠)دا لەباسی زیادبوونی دوو سورەتو کەمبوونەوەی دوو سوورەت دا ئەم فەرموودەیەی سەحیحی موسلیم دەکاتە بەڵگەی پڕوپاگەندەکەی خۆی، وادەزانێت دوو هەنگی لە کلۆری دارێکدا دۆزیوەتەوە.

فەرمودەکەی سەحیحی موسلیم ئەمەیە" ئەبوموسای ئەشعەری نێردرا بۆ بەصرە بۆ کارێك، لەوێ(٣٠٠) پیاوی ئایینی لێکۆبووەو ئەویش پێی وتن:" لە کاتی خۆیدا سوورەتێکی درێژو توندمان وەك سوورەتی (التوبة ـ البراءة) دەخوێندەوە, ئێستا لە قورئاندا نەنووسراوەو من لە بیرم چۆتەوە, بەڵام ئەم بەشەیم لە بیرماوە کە دەڵێت: " لوكان لابن ادم واديان من مال لابتغى واديا ثالثا ولا يملا جوف ابن ادم الا تراب"، هەروەها سوورەتێکی تریشمان دەخوێندەوە تەنها ئەم بەشەیم لە خەیاڵدا ماوە " يأيها الذين امنوا لم تقلون مالا تفعلون فتكتب شهادة فى اعناقكم فتسألون عنها يوم القيامة".

ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە بۆ (زەردەشتی)و هەموو خوێنەرانیش لە فەرموودەیەکی سەحیحی بوخاریدا هاتوە کە (ابن كثير) لە تەفسیری سورەتی (التكاثر)دا نقڵی کردوە، کە دەڵێت: " عن أبى بن كعب قال: كنا نرى هذا من القران حتى نزلت "الهاكم التكاثر" يعنى لوكان لابن ادم واد من ذهب" ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت:" ئێمە پێمان وابوو لوكان ابن ادم .. ئایەتی قورئانە تا ئەو کاتەی " الهاكم التكاثر" دابەزی".

کەواتە لە ناو هاوەڵانی پەیامبەردا هەبووە ڕاڤەو تەفسیری ئایەتی لێبووە بە ئایەت، تا بۆی ڕوون بووەتەوە، دیارە لای ئەو هاوەڵانەی کە نووسەری ڕەسمیی قورئان بوون ئەم گرفتە نەبووە، چونکە پەیامبەر ئاگاداری کردبوون جگە لە قورئا ن هیچی دیکە نەنووسنو ساڵانەش پەیامبەر پاش خوێندنی جبریل بۆی ئەویش کۆی ئایەتو سورەتە دابەزیوەکانی بۆ هاوەڵانی دەخوێندەوە.

بەشی دووهەمی فەرموودەکەش بە ڕوونی دیارە کە هەندێکی ڕاڤەی ئایەتەکەیە، "يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ" ئایەتێکە لە سورەتی "الصف" " فتكتب شهادة فى اعناقكم عنها يوم القيامة " ڕاڤەی ئایەتەکەیەو بەم شێوەیەیە:" ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە بۆچی ئەیڵێن ئەوەی بەکردەوە نایکەن". " چونکە ئەو بڕیارو قسانە لە گەردنتاندا دەنووسرێتو پرسیارتان لێدەکرێت لەسەری". ئەمە ڕوونکردنەوە ئایەتەکە بوو.

هەرچەندە (زەردەشتی) لە کاتی نەقڵکردنی ئایەتەکەدا (ال) خستبووە سەر ( شهادة) کەواتای تێکدەدا کە گەڕامەوە سەر صەحیحی موسلیم بینیم بەبێ (ال)ە.

ئەگەر هەندێ نووسەر نووسیویەتی ئەمانە ئایەت بوون، نەسخ بوون، ئەمە ڕاست نییە، چونکە (نەسخ) تەنها بەشی ئایاتی ئەحکام دەگرێتەوە، ئەویش لە سنوورێکی زۆر کەمدا, ئەم دوو بڕگەیەش هەواڵنو ڕاڤەی ئایەتی پێکراوەو هیچی تر، وەك چۆن فەرموودەکەی بوخاری ڕوونیکردەوە.

ئەو بەڵگانەی تۆ باست لێوە کردوون هەر بەو شێوەیەن، بۆ نموونە کە دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل دەڵێت: "البقرة" بە وشەی "آمين" کۆتایی دێت، ئەوە دیارە کە سورەتی " البقرة" دوو ئایەتی کۆتایی هەمووی پاڕانەوەیەو (آمين) کردنی دوای پاڕانەوە سوننەتەو ئیماندارانی کە لە سورەتی (البقرة) بوونەوە (آمين) دەکەن. چونکە پەیامبەر فێری کردوون وەڵامی ئایەتەکان قورئان بدەنەوە, دوای پاڕانەوەی ئامینو دوای باسی دۆزەخ پەناگرتن بەخواو دوای باسی بەهەشت داواکردنو دوای باسی لێبووردەیی خوا داوای لێبووردن کردن، بەو شێوەیە تا کۆتایی.

١٢. (خوێننامە) لە لاپەڕە (٤١)دا دەڵێت:" وەك دەرکەوتووە ئەم ئایەتانە ئێستا لەم مەسحەفەی بەردەستدا نییە، گومانیش لە ڕیوایەتی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس کەمێك قورسە، چونکە خۆشەویستی پەیامبەرو جێی متمانەی بووە".

کاکە.. خۆشەویستیو ڕق لێبوون نەبووەو نابێتە بنەما بۆ وەرگرتنی ڕیوایەت یان ڕەفزکردنی، بەڵێ عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خۆشەویستی پەیامبەر ﷺ بووەو موسڵمانان بە یەکێك لە سەرچاوەکانی خۆیان زانیوە بۆ وەرگرتنی زانستەکانی ئیسلام، بەڵام بوونی ئەم پلەیە وای لێکردووە کەسانی نیاز پیسو تینو بە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی قسەی

بەدەمەو هەڵبەستن و زانایانی فەرموودەش خوایان لێڕازی بێت بەپێی یاساکانی وەرگرتنی فەرمودە درۆو هەڵەبستراویان لە ڕاست و دروست جیاکردۆتەوە.

١٣. لە لاپەڕە ٤٣ دا دەڵێت:" گومان لە چوار سورەت هەیە دوانیان (الحفد و الخلع) لە قورئاندا نەنووسراون و دوانیشیان (الناس.. الفلق) پاڕانەوەیەو پەیامبەر وەك نزایەك خوێندونیەتەوە، کەچی وەك سورەت لە قورئاندا نووسراونەتەوە". ئەو ڕیوایەتانەی تۆ باسی دەکەیت دەربارەی (الحفد والخلع) نابنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە قورئا ن بن و دابەزی بن، بەڵکو دووعا بوون و لە قنوتدا خوێندراون.

ئەوەش کەدەڵێت دەربارەی ئەوەی کە (الناس، الفلق) پاڕانەوەن و قورئان نین ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە، ڕیوایەتەکەی ئیبن مەسعود ڕاست نییە, خاوەنی (مناهل العرفان فی علوم القران) دەڵێت: "ئەو ڕیوایەتە ڕاست نییە، بەڵکو بە کۆی دەنگی زانایان (الناس، الفاتحة، الفلق) لە قورئانن" نەوەوی لە (شرح المهذب)دا دەڵێت:" هەموو موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە (الفلق، الناس، الفاتحة) لە قورئانن و هەر کەسێك گومان لەوانە بکات کافرە".

لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە ئیبن مەسعود دەڵێت:" ئایا نابینی ئەم شەو چەند ئایەتێك دابەزیوە وێنەیان نەبینراوە " قل أعوذوا برب الفلق" و" قل أعوذوا برب الناس""[1].

بەڵام ئاشکرایە نووسەری (خوێننامە) ئاگای لە چۆنیەتی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان نییە. بۆیە بە پێویستی دەزانم لێرەدا زۆر بە کورتی باسی چۆنیەتی نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بکەم.

چۆنیەتی نوسینەوەو کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لەسەردەمی ئەبوبەکرو سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان دا خوایان لێڕازی بێت:

ئەبوبەکری سدیق پاش ئەوەی موسڵمانان هەڵیانبژاردو بوو بە خەلیفە تووشی چەند گرفتێکی توند بوویەوە, یەکێك لەو ڕووداوانە ڕووداوی یەمامە بوو لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا، کە کۆمەڵێك لەوانەی هەموو قورئانیان لەبەر بوو شەهید کران ژمارەیان نزیکەی (٧٠) سەحابی دەبوو. بەناوبانگترینیان سالمی غولامی حوزەیفە بوو، ئەم ڕووداوە موسڵمانانی داچڵەکاند، لە هەموویان زیاتر عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێڕازی بێت، چوویە لای خەلیفە ئەبوبەکرو پێشنیاری کۆکردنەوەی قورئانی کرد، نەك کوشتن و مردن زۆرێك لە حافزەکانی قورئان بپێچێتەوە.

لە پێشدا خەلیفە ئەبوبەکر کەمێك دوو دڵ بوو لەو کارە، نەك ئەوە بە (بیدعە) بژمێردرێت، بەڵام پاش مشتومڕو موناقەشەی عومەری کوڕی خەتتاب بۆی ڕوون بوویەوە بەرژەوەندی موسڵمانان لە ڕاکەی عومەر دایەو کۆکردنەوەی قورئان باشترین هۆکارە بۆ پاراستنی لە تیاچوون و گۆڕانکاری.

هەروەها بیدعەش نییە، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ نووسەری قورئانی هەبووەو حیزب و ئایەتەکانیشی پێ ڕیزکردوون لە ژێر ڕێنمایی جوبرەئیلدا. پاش ئەوە خەلیفەی موسڵمانان بڕیاریدا بە ڕاکەی عومەر بکات، بۆ ئەم مەبەستە باشترین هاوەڵی پەیامبەری بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەم کارە دانا، ئەویش زەیدی کوڕی سابت بوو.

ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: زەیدی کوڕی سابت وتی:" ئەبوبەکر پاش ڕووداوەکەی یەمامە، واتە پاش کوژرانی (٧٠) لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو ناردی بە شوێنمداو وتی: عومەر هاتووە بۆ لام و دەڵێت: کوشتاری ڕۆژی یەمامە ژمارەیەك لەوانەی قورئانیان لەبەرەکانی قەتڵ و عام کردووە، ئەترسم لە چەند شوێنێکی تر دا بەو شێوەیە لێیان بکوژرێت ئەڵێت با قورئان کۆبکەینەوە. زەید دەڵێت: منیش بە عومەرم وت: چۆن کارێك بکەین کە پەیامبەر نەیکردبێت، عومەر وتی: بەخوا ئەمە خێرەو وازی نەهێناو گفتوگۆی لەگەڵ کردم تا خوای گەورە دڵی منیشی بۆ کردنی ئەوکارە گۆڕی و ڕام هاتە سەر ڕاکەی عومەر. زەید دەڵێت ئەبوبەکر بە منی وت : تۆ گەنجێکی عاقڵیت و دڵنیاین لێت و هیچ تۆمەتێکت لەسەر نییە. بێگومان تۆ لە خزمەت پەیامبەردا وەحیت دەنووسییەوە، دەست بکە بە نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان.

---

[1] ـ مناهل العرفان فی علوم القران ج١ ص٢٦٢.

زەید ئەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر فەرمانی گواستنەوەی شاخێکیان بدایە بەسەرمدا لام ئاسانتر بوو لەو کارە، بۆیە وتم: چۆن شتێك دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە، ئەبوبەکریش وازی لێم نەهێناو موناقەشەی لەگەڵ کردم تا ڕازی بووم بەوەی عومەرو ئەبوبەکر کەوتبوویيە دڵیان.

دەستوورو یاسای ئەبوبەکر بۆ کۆکردنەوەی قورئا ن

زەید بەرنامەیەکی توندوتۆڵی گـرتەبەر بۆ نووسینەوەی قورئان، بەرنامەکەش ئەبوبەکرو عومەر دایان ڕشتبوو. ئەو بەرنامەیە زەمانەتی تەواوی پاراستنی قورئان تێدابوو، بۆ نووسینەوەی قورئان تەنها پشتیان بە لەبەرکراوی (حفظ) یان نووسراوەکان نەبەست یان بە لەبەرکراوی خۆی, بەڵکو پشتیان بە دوو ڕێگە بەست:

یەکەم: ئەوەی لەبەردەستو لە ژێر چاودێری پەیامبەردا نووسرابێت بە شاهیدی ئیمانداران.

دووەم: ئەوەی لە سنگی هاوەڵاندا هەڵگیرا بوو.

جگە لەمانەش ئەوەندە زیاد ئیحتیاتی کردبوو نووسراوەکانیشی بەشایەتیدانی دوو شاهێدی عەدل وەردەگرت، ئەگینا ڕەفزی دەکرد. ئەو فەرموودەیەی تۆ باست کردوە، کە کۆتایی سورەتی (البراءة)یەو تەنها لای ئەبی حوزەیفە بووە، ئەوە واتای ئەوەیە بەنووسراوی لای ئەو بووە، بەڵا م بە لەبەرکراوی لای زەید خۆیو زۆرێك لە هاوەڵا ن هەبووەو ئەبوبەکرو عومەریش لەبەریان بووە.

بەڵام بۆ ئەوەی لە یاسای نووسینەوەکە دەرنەچن داوای ئەوەیان دەکرد ئایا بە نووسین لای کەسی تر هەیەو زیادە ئیحتیاتی هاوەڵان بووە بۆ ئەمانەت پارێزی، نەك وەك ئەوەی تۆ ئیدعای دەکەیت، کە گوایە عومەرو هاوەڵان بە ئارەزووی خۆیان نووسیبێتیان.

داوا لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری "مناهل العرفان فی العلوم القران" بکەن بەرگی یەکەم.

دەستورو یاسای خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان بۆ دووبارە نوسینەوەی قورئانو یەکگرتنی حەوت جۆرە خوێندنەوەکە.

لە کۆتایی ساڵی بیستو چواری کۆچیداو سەرەتای ساڵی بیستو پێنج خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان خوای لێڕازی بێت" فەرمانی کۆپیکردنەوەی قورئانی سپارد بە چوار سەحابەی ئەمینو حافزی قورئان، ئەوانیش:

١. زەیدی کوڕی سابیت "سەرپەرشتیاری کۆکردنەوەی یەکەم".

٢. عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر.

٣. سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص.

٤. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام.

ئەوجا ناردی بۆ لای دایکی ئیمانداران حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب کە مەسحەفەکەی لای خۆیان بۆ بنرێت تا لەسەری بنووسنەوە. ئەو مەسحەفەی حەفسەش نوسخەیەکی ئەو مەسحەفە بوو کە لە زەمەنی خەلیفە ئەبوبەکردا نوسرابوویەوە, "خوا لە هەموویان ڕازی بێت".

لیژنەکە مەسحەفەکەی حەفسەیان وەرگرتو دەستیان کرد بە کارەکەیان، کاری ئەم لیژنەیە تەنها ئەوەندە بوو بەو شێوەیە بینووسنەوە کە لە کۆتا پێداچوونەوەی پەیامبەردا وەریانگرتووە.

پاشان ئەو وشانەی کە لە هەمو جۆرەکانی خوێندنەوەدا جیاوازی لەسەر نەبوو بەیەك شێوە دەیانووسیو ئەوەش کەجیاوازی خوێندنەوەی لەسەر بوو لە خوێندنەوەیەك بۆ خوێندنەوەیەکی تر بەبێ خاڵ دەیاننوسییەوە بۆ ئەوەی بە هەموو جۆرەکان بخوێندرێتەوە.

وەك وشەی:

مسوا ، فتبینوا . فتثبتوا .

سرها . ننشزها . ننشرها .

ئەم جۆرانە لە خوێندنەوە هەر لە پەیامبەرەوە وەرگیراوەو پەیامبەر فەرموویەتی " فأي ذلك قرأتم فلا تماروا". واتە:"بەهەر شێوەیەك لەو شێوانە بیخوێنن دوو دڵ مەبن".

ئیمامی عوسمان بە لیژنەکەی فەرموو: "ئەگەر ئەو سیانەتان کە قورەیشین لە لەگەڵ زەیددا جیاوازیتان هەبوو ئەوا بە زمانی قورەیشییەکان بینووسن، چونکە بە زمانی ئەوان دابەزیوە".

تایبەتمەندییەکانی ئەم کارە پیرۆزەی خەلیفە عوسمان لەم خاڵانەدا کۆ دەکرێتەوە:

١ . تەنها ئەوەی بە تەواتور سابت بووە نوسییانەوە.

٢ . وازهێنان لەوانەی کە لە کۆتا پیاچوونەوەی پەیامبەردا نەهاتبوو.

٣. تەرتیبکردنی سوورەتەکان بەو شێوەی لە کۆتا پیاچوونەوەی پەیامبەردا هاتبوو.

٤ . نووسینەوەی بە جۆرێك کە هەموو جۆرەکانی خوێندنەوە هەڵبگرێت.

٥ . جیاکردنەوەی قورئان لە هەموو ئەوەی کە قورئان نییە، واتە ڕاڤەی ئایەتو ڕوونکردنەوەی ئەوانەی تایبەت بوون بە نووسەرەکانەوە.

هەموو هاوەڵانو خاوەن مەصحەفەکان بێدواکەوتن کاتێك ئەم وردەکاریو چاکخوازییەیان بینی لە مەسحەفەکەی عوسماندا هەموو مەصحەفەکانی لای خۆیانیان سووتاند، تەنانەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش کە یەکەمجار کەمێك دوو دڵ بوو بۆ سووتاندنی مەصحەفەکەی لای خۆی، بەڵام کاتێك بینی ئوممەتی ئیسلامی کۆدەنگن لەسەر مەصحەفەکەی عوسمانو پڕە لەبەرژەوەندی موسڵمانان هاتەوە ڕیزی باقی هاوەڵانو ئەویش ئەوەی خۆی سووتاند.

هەر ئەو کاتە مەصحەفەکانی ئیبن مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعبو عائیشەو سالم بوون بە باسێکی ڕابردوو بە ئاو شۆردرانەوە سووتێنران[1].

ئیتر ئەوەی بەدەم ئەم هاوەڵە بەڕێزانەو مەصحەفەکانیانەوە دەوترێت هەموی درۆیە، (جگە لەوەی لە فەرمودە سەحیحەکاندا هاتووە).

١٤ . لە لاپەڕە (٤٨)دا دەڵێت ئایەتی ٢٣٨ لە سورەتی (البقرة)دا نووسراوە (حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى) ئەم ئایەتە هەڵەیەو لە ڕاستیدا ئاوەهایە " حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى والصلاة العصر". (زەردەشتی) هەر لە خۆیەوەو بێ هیچ بنەمایەکی زانستی دەڵێت ئەمە هەڵەیە، ئەوە ڕاستە. ئەگەر (زەردەشتی) گومانی لە ڕیوایەتە موتەواتیرەکان (متواتر) هەیە چۆن ڕیوایەتی ئاحاد (آحاد) باوەڕ پێدەکات؟!!

بەهەر حاڵ:

"حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى" ئایەتەکەیەو (صلاة العصر) ڕاڤەی (صلاة الوسطى)یە کە نوێژی عەسرە لای زۆرێك لە موفەسیرەکان.

١٥. لە لاپەڕە (٤٩)دا دەڵێت : "هەر لە سەر جیاوازی ئایەتەکان ناکۆکیو شەڕ کەوتۆتە نێوان زۆرێك لە صەحابەکانو یەکتریان تەکفیرو نەفرەت کردووە".

لە هیچ ڕیوایەتێکی سەحیح دا نەهاتووە کە جیاوازی کەوتبێتە نێوان صەحابەکان لەسەر ئەم مەصحەفەی لەبەر دەستدایە بەڵکو کۆدەنگی موسڵمانانی لەسەرە.

کاتێك زەردەشتی دەڵێت "صەحابەکان یەکتریان تەکفیرو نەفرەت کردوە، ئاماژە بە سەرچاوەی (جامع لأحكام القران) دەکات کە گەڕامەوە سەری دەبینم دیسان هەڵەیەکی گەورەی لە وەرگێڕاندا کردوە. کە تۆ عەرەبی نازانیت بۆچی دەستی دەبەیت؟

بۆ زیادە چاوڕۆشنی خوێنەر دەقە عەرەبییەکە نەقڵ دەکەین، پاشان بزانن لە کوێدا زەردەشتی لێی تێکەڵ بووە.

[1] مناهل العرفان فی علوم القران ج١ ص ٢٤٦ ـ ٢٥١.

" وانما فعل ذلك عثمان لأن الناس اختلفوا في القراءات بسبب تفرق الصحابة في البلدان واشتد الامر في ذلك وعظم أختلافهم وتشبثهم ووقع بين اهل الشام والعراق ماذكره حذيفة (ر.ض) وذلك انهم اجتمعوا في غزوة ارمينية فقرأت كل طائفة بما روى لها، فاختلفوا وتنازعوا واظهر بعضهم اكفار بعض والبراءة منه وتلاعنوا، فاشفق حذيفة مما راى منهم، فلما قدم الحذيفة المدينة (فيما ذكر البخارى والترمذى) دخل الى عثمان قبل ان يدخل الى بيتة. فقال:ادرك هذة الامة قبل ان تهلك. قال فيماذا؟ قال في كتاب الله. انى حضرت هذة الغزوة و جمعت ناسا من العراق والشام والحجاز فوصف لة ما تقدم وقال انى اخشى ان يختلفوا فى كتابهم كما اختلف اليهود والنصارى".

١. ئەوەی زەردەشتی دەڵێت "هاوەڵەکان تەکفیرو نەفرەتی یەکترییان کردوە" وانییەو هاوەڵانی پەیامبەر زۆر گەورەترن لەوەی هەڵەی لەو شێوە بکەن، ئەوانەی نەفرەتی یەکیان کردووە کۆمەڵێك لە خەڵکی عیراق و شام بوون، ئەوانەی کە هەر کۆمەڵێکیان تەنها ئاشنای یەك جۆر لە خوێندنەوەکان بوون و ئاگادار نەبوون لەوەی خوێندنەوەکەی تریش ڕاستە، بۆ دەرچوون لەم مەترسیو جیاوازییە خوێندنەوەکان کران بەیەك.

٢. هاوەڵانی پەیامبەر زۆر زوو فریای مەترسی دروستبوونی جیاوازی دەربارەی قورئان کەوتوون دیارە جیاوازیش لای کەسانی کەم شارەزاو کەم زانیاری ڕوودەدات. وەك تازە موسڵمانەکان عێراق و شام. حوزەیفە ڕەزای خوای لێبێت ئەوەندە ئەو ڕووداوە بە زەنگی خەتەر دەزانێت کە دێتەوە بۆ مەدینە پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵەوەو پشوو بدات هەواڵەکە دەگەیەنێتە گەورەی موسڵمانان.

گەورەی موسڵمانانیش لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی تردا لەبەر بەرژەوەندی تازە موسڵمانەکان کە زمانیان زۆرتر عەرەب نەبوون خوێندنەوەکانی یەك پێگرن، نەك بەو شێوەیەی (زەردەشتی) باسی دەکات و لە سێ شوێنی جیاوازدا پارچەیەکی پێکهێناوەو لە وەرگێڕانەکەشدا ئەو هەڵە گەورەی کردووە.

٣. خوێنەری بەڕێز لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئەوەش بڵێم کە (زەردەشتی) هەر هەمان فەرموودەی لە ل(١٤)دا هێناوە و هێندە نەشارەزایە (نصارى) و (أنصارى) لێ ئەبێت بەیەك و لە جیاتی ئەوەی بڵێت " وەك جیاوازی جولەکەو گاور" دەڵێت "وەك جیاوازی یەهودیو ئەنساری"!!

١٦. زەردەشتی لەلاپەڕە (٥٠) تا لاپەڕە (٥٤) باس لە گۆڕینی هەندێ وشە بە هەندێکی تر، وەك وشەی (طلاق) بە (سراح)و (يؤلون) بە (يقسمون) .. (أقيموا بة أتموا).

ئەوانە گۆڕینی وشەی پێناوترێت، بەڵکو جۆری خوێندنەوەکان بووەو پاشان بە زمانی قوڕەیشی نووسراوەتەوە.

لەو کاتەوە تا ئێستە ئەو کارە بە لای موسڵمانەکانەوە گرفت نەبووە، چونکە شارەزای واقیعی ئەو کاتەی موسڵمانان بوون. ئێستەش هیچ گرفت نییە، چونکە هیچ لە ئیعجازی قورئان ناگۆڕێت، بەڵکو پاڵپشتی دەکات.

١٧. لە لاپەڕە (٥٥)دا دەڵێت: "بەپێی سەرچاوەکان، عومەری کوڕی خەتتاب بە ویست و ئارەزووی خۆیو برادەرانی دوو ئایەتی تێکەڵ بە سورەتێك کردووە.."

بەپێی کام سەرچاوە؟؟ ئەگەر ڕاست دەکەیت کوا سەرچاوە؟ ئەی بۆ خۆت هەر لە ل(٥٤)دا دەڵێیت: "عومەر ئایەتێکی وت، بەڵام لەبەرئەوەی شاهیدی نەبوو لێیان وەرنەگرت. ئەگەر ئارەزوی بەکاربهێنایە شایەتی بۆچی بوو؟!. هەروەك چۆن لە پێشەوە باسی ئەم دوو ئایەتەمان کرد کە شایەتی نووسراوی لای ئیبن خوزەیمەو هەڵگیراوی ناو سنگی زەیدو ئەبوبەکرو زۆرێکی تر لە هاوەڵانی پەیامبەری لەسەر بووە. بۆ ئەوەندە ڕق لە عومەر، عومەرێك ئەوەندە پێشبینی بەهێزبووە کە دەیزانی نموونەی (زەردەشتی) لە هەموو چەرخێکدا دروست دەبن، بۆیە لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی تردا ڕایاندایە مەیدان و بەو ڕێبازە توندو تۆڵە ئەو کارە گەورەیان ئەنجامدا.

١٨. لە لاپەڕە (٥٦)دا دەڵێت:" لەقورئاندا هاتووە ئەگەر بێت و هەرچی مرۆڤو جنۆکە کۆببنەوەو هاوپشتی یەکتری بکەن ئەوا نەك دە سورەت، بەڵکو ناتوانن یەك سورەتیش بنووسن. کەچی دەبینین هەر لە زەمانی پەیامبەردا سوورەت و نوسراوەو مێژوونووسان بۆیان تۆمار کردوین. موسەیلەمە کە ئیدعای پەیامبەرایەتی دەکردو قسەکانی کەگوایە فەرمودەی خوایین بۆ خۆی قورئانێکی هەبوو، ئەمەش نمونەیەکە لە قورئانەکەی:" الشاة والوانها واعجبها السود والبانها

والشاة السوداء واللبن الابيض انه لعجب محض وقد حرم المذق فما لكم لا تجعون"...پاشان دەڵێت: "ئەوەی شایانی باسە موسەیلەمە بۆ نووسینەوەی ئایەتەکان کاتب وەحیشی هەبووە. لەگەڵ دەرکەوتنی پەیامبەردا وەك پەیامبەرێك دەرکەوت و خۆی بە پەیامبەرزانی لە نێوانیشیاندا (پەیامبەرو موسەیلەمە) نامە گۆڕدراوەتەوە".

ئەم نووسینانەی لە "جەهالەتی ئیسلام و ئیسلام ناسی وەرگرتووە". (زەردەشتی) بەڕاستی ئەمانەی دەیڵێت کەس ڕوی نەهاتوە بیڵێت، ئایەتەکانی قورئان و قسەکانی موسەیلەمە بەرامبەرکێ پێبکەیت؟! سەیری جیاوازی نێوانیان بکە:

١. قورئان پێناسە کراوە بەوەی بریتییە لە کەلامی خوایی دابەزیو بۆ موحەممەد لە ڕێگەی جوبرەیل، بە تەواتور گەشتووە بە ئێمەو پاداشت لە سەر خوێندنەوەی هەیەو مرۆڤایەتی دەستەوسانە لەوێنەی ئەو بهێنێت، ئەی قسەکانی موسەیلەمە چۆن پێناسە دەکەیت؟

٢. قورئان هەواڵی پێش خۆییو کاتی خۆیو داهاتووی تێدایە کەشایەتن لە سەرئەوەی کەلامی خوایەکی چاودێرو ئاگادارەو معجیزەیە، ئەی موسەیلەمە لەمانە چی پێبووە ؟!!

٣. قورئان هەواڵی زانستیی وای تێدایە کە کەم کەم لە سەردەمە جیاکانی پێشکەوتنی زانستدا عەقڵی بەشەری پێیدەگات، تا قیامەت هێشتا زانست بە گەورەیی خۆی ناگاتە تەواوی زانستەکانی ناو قورئان، ئەی قسە هەلەق و مەلەقەکانی موسەیلەمە لە کوێی ئەمانەدان؟!!

٤. قورئان پاش هاتنی بەچەندەها سەدە کۆن نابێت و خوێنەرەکانی بە درێژی تەمەنیان ئەیخوێنن لێی ماندو نابن، هەر دەم هەست بەنوورو بەرەکەتی تازە دەکەن لە کاتی خوێندنەوەیدا؟

ئەی خوێنەرانی قسەکانی موسەیلەمە چۆنن؟ ئەگەر هەر هەشبن مەگەر تەنها کەسانێکی وەك تۆ سەیرێکی بکەن، ئەویش بۆ مەرامێکی وا نەك بۆ باشی قسەکانی.

٥. قورئان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خەڵك شوێنی دەکەوێت و لە چەرخی عەولەمەشدا دونیاو پێشکەوتنەکانی دونیا دەبنە خزمەتکاریو خەریکە بڵێم مۆرکی ئیسلامەتی دراوە لە زۆرێك لە شارە پێشکەوتووەکانی جیهان و مزگەوتەکان زیاترو زیاتر ئاوەدان دەبنەوە, زیاد بوونی دیاردەی بالاپۆشی لە وڵاتێکی پێشکەوتووی وەك فەرەنسا نیشانەی چییە؟ ئەگەر ئەوەنەبێت کە پاش بەرزبوونەوەی ئاستی زانیاری خەڵك هەست بەگەورەیی قورئان دەکەن.

ئەی موسەیلەمەو قسەکانی لە کوێن؟ کوان ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی؟!!! تۆ دەڵێیت" لە نێوان پەیامبەرو موسەیلەمەدا نامە گۆڕدراوەتەوە"، ئەی بۆ باسی ناوەڕۆکی نامەکە ناکەیت؟! چونکە لە نامەکاندا ئەوە سابت بووە کە موحەممەد پەیامبەرەو موسەیلەمەش درۆزن"، دەزانیت ئەگەر ناوەڕۆکی نامەکان باس بکەیت بەزیانی نووسینەکەت تەواو دەبێت. یان دەڵێیت "موسەیلەمەش کاتب وەحی هەبووە"و سەرچاوەی قسەکانت (تاریخ طبری)و (ئیسلام ناسیی)ە. تەنها مەگەر نموونەی قسەکانی موسەیلەمەی درۆزنت لە (تاریخ طبری) دەرهێنابێت و لای هەموو کەسێك دیارە بۆ ناوی ئەو سەرچاوەیەت لەگەڵ ئەو نامیلکەیەی تردا هێناوە، کەواتە خەڵك دەتوانێت قسەی بێسەرو بەر بکات، بەڵام ناتوانێت لە نموونەی قورئان سوورەتێك دابڕێژێت.

١٩. لە لاپەرە (٥٩)دا باس لە سورەتی (النورين) دەکات و دەڵێت:" نووسینی ئەم سوورەتە بە پێی هەندێ سەرچاوە دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنی ئەمەویو بە پێی ناوەرۆکەکەی وا پێدەچێت کە شیعەکان نووسیویانە" من قسەم لەسەر نووسراوەی (النورين) نییە، چونکە خۆیشت دەڵێیت شیعە نووسیوویەتی.

بەڵام سەرنج لەوێوە دەست پێدەکات تۆیەکی عەرەبینەزان تەقیمی ئەو نووسراوەی کردووەو دەڵێت:" لە ماناو دەق و ڕیتم و ڕێزمان و چڕیو پڕیو بەلاغەت و دەلالەتدا.. کەموکوڕی نییەو هەمان ئەو قورساییەی هەیە کە سوورەتەکانی تری قورئان هەیانە, نابێ ئەوەش بشارینەوە کە تا ئێستا پاش ١٤٠٠ ساڵیش تێپەڕبوونی ئەم سوورەت و ئایەتانە هیچ کەس نەیتوانیوە بچووکترین ڕەخنەی لێبگرێت".

لەپەراوێزدا ئاماژە بەوە دەکەیت کە (فؤاد مجيد ميسري) لە کتێبی (کۆمەڵگا لە سایەی خەلافەتدا) ئەمەی نووسیوەو کەس وەڵامێکی بەپێزی نەداوەتەوە.

**خوێنەری بەڕێز نووسراوی (النورین) لە چەندەها لایەنەوە دیارەو دەریخستووە کە تەحەداکەی قورئان موعجیزەیەو پاش ئەو هەموو هەوڵو کۆششە دەرکەوتووە کەس ناتوانێت وێنەی قورئان بهێنێت باسوورەتێکیش بێت .**

**١. هەوڵێکی زۆری تێدا دراوە هەندێ وشەی بەهێزو ئاوازخۆشی قورئانی تێکەڵ بکرێت، بەڵام بە ئاسانی قسەکانی دەمی ئادەمی لێجیا دەکرێتەوەو لاوازییەکەی دەردەکەوێت.**

**٢. قورئانی پیرۆز هیچ کات خزمەتی بنەماڵەیەکی نەکردووەو پەیامی بنەماڵەیەك نەبووە، تەنانەت پەیامی زمانێك یان گەلێك نەبووە، بەڵکو بۆ جیهان بووەو هەموو گەلان وەك یەك مافیان تێدا هەیە. بەڵام ئەم نووسراوە تەنیا بۆ خزمەتی بنەماڵەیەك نووسراوە.**

**٣. ناکۆکی نێوان مرۆڤەکانو دەمەقاڵەیان نابێتە هۆی کافر بوونیان، چونکە ناکۆکیو دەمەقاڵەو ڕاو ڕای بەرانبەر لە سرووشتی مرۆڤە، خۆ لێدەربازکردن شتێکی زۆر گرانە .**

**ئەم نووسراوە ڕێگەی بەهەشتی ئەوەندە تەسك کردۆتەوە کە تەنها شوێنکەوتوانی عەلی بکێشی, لەگەڵ ئەوەدا خوای گەورە وانا فەرمویێت، هەن لە دونیادا ڕایان جیاواز بووەو لە بەهەشتدا بەیەکەوەن. گرنگ ئەوەیە لە ڕێی خوا لانەدەنو خوا تووڕە نەکەن.**

**٤. "آمنوا بالنورین انزلناهما" ئەگەر دوو نوورە مەبەستی بەحەسەنو حوسەین بێت یان موحەممەدو عەلی یان هەر دوو ئیمامێکی تر بن ئەوا هەر هەڵەیە، چونکە هەر کەسێکیان بێت ئەوا لە زەوی دا لە دایکبوونو دانەبەزیوون .**

**٥. ئەگەر نووسراوی (النورین) توانای بەرانبەرکێی لەگەڵ قورئاندا ببوایە، بۆ لە ڕۆشنبیرانو زانایانی ئەدەب و فیکرو بەلاغە دەشاردرایەوە. بۆ خۆی ئاشکرا ناکاتو خاوەنی نووسینەکە تەحەدای قورئانی پێناکات؟!**

**٦. قورئانی پیرۆز لە ناو گەلێكو بە زمانی کۆمەڵێك دابەزیوە کە لە وتنی شیعرو پێشبڕکێی ئەدەبیدا دەستی باڵایان هەبووەو بازاڕو کۆڕی تایبەتییان بۆ ئەو مەبەستانە هەبووە, کەچی ئەوان هەستیان بە ئیعجازی قورئان کردووەو دەستەوسان بوون وێنەوی بنووسن .**

**کەسێکی وەك وەلیدی کوڕی موغیرە کاتێك گوێی لە قورئان دەبێت دەڵێت: "والله لقد سمعت من محمد کلاما ماهو من کلام الانس ولا من کلام الجن، وان لة لحلاوة, وان علیه لطلاوة, وان اعلاه امثمر وان اسفلة لمعذق"[1].**

**"سوێند بە خوا قسەیەکم لە موحەممەد بیستووە کە نەقسەی مرۆڤەو نەقسەی جنۆکەیە، بەڕاستی ئەو قسانە زۆر شیرینن، بەڕاستی سیمای جوانو ڕازاوەیە، بەرزترینی بەرهەمدارەو خوارترینی زۆر بە پیتە" .**

**کەسانی تری وەك حەسانی کوڕی سابیتو خەنساو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە لەگەڵ شارەزاییو زمانپاراوی خۆیاندا لەبەردەم بیستنی قورئاندا سەرسام دەبنو دەزانن مرۆڤ ناتوانن وێنەی ئەو بهێنێدنو باوەڕی پێدەهێنن کە کەلامی خوایە. لەگەڵ ئەوەدا لەبەردەم (نابغە)دا پێشبڕکێ یان کردووەو تەنانەت لەگەڵ (نابغە) خۆیشیدا. کە نابغە شوێنی دیاریکراوی هەبووە لە بازاڕی (عکاظ)و خەڵك چوونەتە لای تا هۆنراوەکانیان بۆ تەقییم بکات.**

**قورئانی پیرۆز ڕۆڵێکی گرنگی بینی بۆ گەشەکردنی (ڕەوانبێژی)و ڕەوانبێژەکان لەسەردەمە جیاجیاکانی پاش دابەزینی قورئان سوودیان لە قورئان وەرگرتووە، چەندەها زانیارییان لە بواری ڕەوانبێژیدا لەسەر نووسیوە، یەکێك لە ئایەتەکانی قورئان بۆ کەسێکی وەك ئەبوعوبەیدەی زانای بەسرە دەبێتە بناغە بۆ دانانی کتێبەکەی لەسەر (مجاز)[2].**

**(محمد بن الطیب بن الباقلانی) کە پەڕاوی (أعجاز القران)ی داناوە دەڵێت:" کتێبەکەی خوا موعجیزەیە، چونکە بە شێوەیەك داڕێژراوە بە دوور لە شێوەکانی داڕشتنی باوی نێوان خەڵکی عەرەب" .**

---

[1] ـ"**البلاغة والتطبیق" د. أحمد مطلوب و د. حسن البصری** ل٧، شایەنی باسە کە ئەمەش کەسێکە موسڵمان نەبووە و وەك نوێنەری بێباوەڕان چووە قسەو گفتوگۆ لەگەڵ پەیامبەردا بکات، پاش گفتوگۆیەك کە گوێی لە قورئان دەبێت ئیتر قسەی پێ نامێنێو دەچێتەوە ناو هاوەڵەکانیو ئەم قەسەیە دەکات.

[2] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل١٩.

٧. ئەگەر بەڵگەی تۆ بۆ بەهێزی ئەو نووسراوە کتێبەکەی (فؤاد مجید میسری)یە، ئەوا کۆمەڵگاکەی ئەو لە کتێبە خوێناویەکەی تۆ باشترنییەو بەویستی خوا قەڵەمێکی ترو نووسینێکی بە پێز وەڵامی ئەو دەداتەوە.

٢٠. لە ل(٦٣) بۆ لاپەڕە (٦٨) (خوێننامە) لە کتێبی نووسەر (عبدالله عبدالقادری) سێ خاڵ وەردەگرێت و دەیکاتە شایەت لەسەر قسەکانی لەوەو پێشی خۆیو دەڵێت:

"یەکەم: لە قورئاندا ئاماژە بەوە کراوە کە قورئان بە زمانی عەرەبی پاراو دابەزیوە، کەچی پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە کە چەندین وشەی فارسیو ئاشوریو سریانیو میسریو حەبەشی تێدایە.

دووهەم: چەند وشەیەك لە قورئاندا هەن کە تا ئێستاش ماناکانیان نامۆیە، بەم هۆیەوە چەندین ڕاڤەی جیاوازیان هەڵگرتووە.

سێهەم: چەندین وشەو ڕستە بەسەرهاتو چیرۆك بۆ چەند جارێك دووبارەو سێبارە کراونەتەوە".

خوێنەری هۆشیارو کاکی نووسەر سەیری وەڵامی هەریەکە لەو خاڵانە بکە:

یەکەم: بە نووسەری (خوێننامە) دەڵێین: تۆش لە (خوێننامە)کەتدا تەنها لەسەرەتاکەدا کە لاپەڕە (٣و٤)ە نزیکەی (٢٠) جار وشەی جگە لە کوردیت بەکارهێناوە.

ئایا لەبەر بوونی ئەم وشانە دەکرێت من بڵێم درۆیە (خوێننامە) کوردی نییەو بە کوردی نەنووسراوە, یان ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەڵێ بەزمانی کوردان نووسراوە و لە ناو کوردیدا ئەو وشانەش کە جگە لە کوردین بەکاردێت و بۆتە بەشتێکی باو.

قورئانی پیرۆزیش بە زمانی عەرەبیو خەڵکی ئەو سەردەمە هاتووەو لەبەربوونی چەند وشەیەك کە عەرەب تیایدا بەشدارە لەگەڵ زمانەکانی تردا بڵێین عەرەبی نییە؟. بەڕاستی ئەم قسەیە زۆر دوورە لە واقیعو ڕاستییەوە.

دووهەم: بە نیسبەت بوونی زیاتر لە مانایەك بۆ چەند وشەیەکی ناو قورئان ئەوە خوای گەورە حەقیقەتی ئەو باسەی لە ئایەتی حەوتی (ال عمران) دا باسی کردووەو دەفەرموێت:" هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ" واتە:" ئەوە کە خوا کتێبێکی نازڵ کردووە سەرت، تیایدا ئایاتی نەگۆڕی هەن کە بناغەن بۆ کتێبەکەو هەندێ ئایاتی نادیاریش هەن".

واتای ئایەتی (محکم)و (متشابه) لای زۆربەی ئسوڵیەکان ئەوەیە :

(محکم) ئەو ئایەتانەن کە تەنها یەك واتا هەڵدەگرن و بەیەك شێوە ڕاڤە دەکرێن، بەڵام (متشابه) ئەو ئایەتانەن زیاد لە واتاو ڕاڤەیەك هەڵدەگرن.

سیوطی دەڵێت: "محکم واتاکەی ڕوونو دیارەو متشابه پێچەوانەی (محکم)ە"[1]. شایەنی وتنە لێرەشدا ئەوە بڵێین (خوێننامە)یش و عەبدوڵلا عەبدولقادریش تەنها یەکجۆر ئایەتی (متشابه) یان باسکردووە، بەڵام لە قورئاندا سێ جۆر ئایەتی (متشابه) هەیە:

ا. نادیاری لە وشەکەدا.

ب . نادیاری لە واتای وشەکەدا.

ج . نادیاری لە وشەو واتادا.

دوو جۆرەکەی کە جێگای سەرنجی تۆ نەبووە باسی ناکەین. ئەگەر بابەتیانەو بێ دەرماگیری قورئانتان بخوێندایە دەتانبینی ڕاڤەی زۆرێك لە ئایەتە موتەشابیهەکان هەر لە قورئان خۆیدا هەیە.

بۆ نموونە تۆ وشەی (وأبا)ت هێناوە، جگە لەوەی لێت تێکەڵ بووە (واو)ەکەشت هەر بە پیتی وشەکە زانیوە لە کاتێکدا کە واوی (عطف)ە دەڵێیت "ئەمە یەکێکە لەو وشانەی ماناکەی دیارنییە". بەڵام خوای هەر لە ئایەتی پاش ئەو ئایەتەدا

[1] (الاتقان فی علوم القران) لە باسی ئایەتەکانی (محکم و متشابه) کی سیوطی لە (طیبی)ەوە دەیگێڕێتەوە.

ڕاڤەکەی کردووە دەفەرموویێت:" وَفَاكِهَةً وَأَبّاً مَّتَاعاً لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ". "فاكهة" دیارە میوەیەو خۆراکی مرۆڤە (أبا)ش لەوەڕ بۆ حەیوانەکان, هەموو ئەو بەشەی تۆ بە نموونەت هێناوەتەوە لە قورئان و فەرموودەدا واتاکانی دیاریکراوە.

سێهەم: لەوەڵامی چەند جارو لە چەند شوێنێکدا باسی یەك چیرۆك کراوە و دووبارە و سێ بارە کرابێتەوە.

لە هەمان لاپەڕە، واتە لاپەڕە (٦٦)دا باسی چیرۆکەکانی قورئان دەکات زەردەشتی دەڵێت:" هەروەها دەوترێت ئەم ئایەتە ئایەت نییە و خراوەتە ناو قورئانەوە "وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ.." ١٥ النساء.

باسکردنی ئەم ئایەتە پیرۆزە لێرەدا هیچ پاساوێکی نییەو بێ موناسەبەیە، بەڵام ئایا (دەوترێت یان وتراوە) دەبێتە بنەمای زانستیی و هیچ شتێکی لەسەر بنیات دەنرێت؟! من پرسیاردەکەم.. کێ وتیو لە کوێ وتراوە؟ بۆ سەرچاوەی ئەم هەڵەیەت نەنووسیوە ئەگەر هەیە!!

کاکە واباشە بۆ تۆ پاش ئەم ڕوونکردنەوەیەی من بۆ چیرۆك و بەسەر هاتەکانی ناو قورئانی پیرۆز، قورئانەکەی خوا بخوێنیتەوەو سەیرێکی وردی چیرۆکەکانی بە تەنها بکەیت و بیدەیتە دەم یەك، ئەو کات بۆت ڕوون دەبێتەوە کە:

١. قورئان پەڕاوی چیرۆك نییەو هێنانی باسی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانە مەبەستی گەورەی پەروەردەکردن و ڕۆشنبیرکردنی خەڵکانی لەدوایە.

٢. پاش و پێشی ئەڵقەکانی زنجیرە بەسەرهاتەکە بخوێنەوەو سەیرێکی گشتی سورەتەکەش بکە، ئەو کاتە دەزانیت بۆچی تەنها ئەو ئەڵقەیە لە زنجیرەکە لەوێ دا باسکراوە.

٣. زۆرێك لەو بەسەرهات و چیرۆکانە گرفتی فیکری و بۆچوونەکانی خەڵکی چارەسەر دەکەن و بۆچوونی ڕاست و دروست لای خەڵکی بنیات دەنێن, بەمەش زۆرێك لەگرێ دەروونییەکان دەکرێنەوە.

٤. پاش تێڕامان و وردبوونەوە بۆت دەردەکەوێت دووبارە بوونەوەو چەند بارە بوونەوە نییە، بەڵکو هەر جارەی هەڵقەیەك یان چەند هەڵقەیەك لە زنجیرەیەك باسکراوەو ئەگەر لە هێنانی هەر هەڵقەیەکدا کەمێك هەڵقەی پێشوو دووبارە بێت ئەوە لەبەرئەوەیە کە ئەو وشە یان ئەو باسە زۆر سابت بێت و بەلای خواوە زۆر گرنگەو لە زهنی خوێنەردا پاش سابت بوون ببێتە مەلەکە.

مامۆستایەکی سەرەتایی کە دەیەوێت قوتابییەکانی ئاشنا بکات بە پیتێك سەیر دەکەیت تاسەری ساڵ ئەو پیتە چەند جار دووبارە دەکاتەوەو هەر جارەی لەگەڵ چەند پیتێکی تازەداو پاشان بۆ پیتە تازەکان هەمان ڕێکار بەکاردەهێنێتەوە.

ئەگەر مامۆستایان و زانایانی پەروەردە گەشتوونەتە ئەوەی چەند بارەکردنەوە خورپە دروست دەکات و پاشان خورپەش حاڵەت دروست دەکات و چەندبارەبوونەوەی حاڵەتیش مەلەکە لە مرۆڤدا دروست دەکات. ئەی دەبێت خوایەك کە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییەو خۆی مرۆڤی دروستکردووە چۆن ئەو شێوازە بەکارنەهێنێت بۆ پەروەردەکردنی بەندەکانی و بەرچاو ڕۆشنکردنیان بۆ ژیان لەم تاریکستانی نەفامیەدا؟

کاکی نووسەرو خوێنەری بەڕێز من بۆ نموونە باسی هەندێك لە بەسەرهاتەکانی ئادەم پەیامبەر (علیە السلام) لە قورئاندا دەکەم و هەموو ئەو سوورەتانەی ناوی ئادەمی تێداهێناوە ناوی دەبەم تۆش بە وردی سەرنجی بدە، بەڵکو لەم یادخستنەوەدا کەڵکی هەموو یەکێکمانی تێدا بێت "فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَى".

ناوی ئادەم پەیامبەر (علیە السلام) لەم سوورەتانەدا هاتووە: "البقرة، ال عمران، المائدة, الاعراف، الاسراء، الكهف، طة، ص، الحجر" فەرموو ئێوەو هەندێ باس و بەسەرهاتی باوکە گەورەی مرۆڤایەتی لە قورئانی پیرۆزدا:

سورەتی البقرة: "وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ (٣٠) وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٣٤) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ

وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (٣٦) فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧) قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨)"

واته:" كاتێك پەروەردگاری تۆ (موحەممەد) بە فریشتەكانی وت: من لە زەویدا جێنشین دادەنێم، فریشتەكان وتیان: ئایا كەسێك دادەنێیت كە خراپە بكات لە زەویداو خوێنی تێدا بڕژێت، ئێمەش تەسبیحاتی تۆ دەكەین‌و سوپاسگوزارین، تۆ بە پاك ڕادەگرین. خوا فەرمووی: ئەوەی من ئەیزانم ئەوەی ئێوە نایزانن، خوا ئادەمی فێری هەموو ناوەكانی سەر زەوی كردو پاشان پیشانی فریشتەكانی داو فەرمووی ئەگەر ڕاست دەكەن ناوی ئەوانەم پێبڵێن. ئەوانیش وتیان: پاك‌و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە، ئێمە نازانین جگە لەو شتانە نەبێت خۆت فێرت كردووین، ئەوە هەر تۆی كە زاناو زۆر كار دروستیت. خوا فەرموی: ئەی ئادەم تۆ هەواڵی ناوەكانیان پێبدە، كاتێك ئادەم هەواڵەكانی پێدان خوا فەرمووی: ئایا پێم نەوتن من نهێنییەكانی ئاسمانەكان‌و زەوی دەزانم، ئەزانم چی ئاشكرا دەكەن‌و چی دەشارنەوە.

كاتێكیش وتمان بە فریشتەكان كە كڕنووش بەرن بۆ ئادەم، هەموویان كڕنووشیان برد ئیبلیس نەبێت، نەیكردو خۆی بە گەورەزانی‌و لە كافرەكان بوو, گوتمان: ئادەم تۆو خێزانت لە بەهەشت دا بمێننەوە هەرچیتان ویست بیخۆن‌و نزیكی ئەو درەختە مەكەون، ئەگینا لە ستەمكاران دەبن. شەیتان لایدان‌و لەو بەهرەو نیعمەتانە دەریكردن، ئێمەش وتمان: دابەزن، هەندێكتان بۆ هەندێكتان دوژمنەو لە زەویدا بۆ ئێوە شوێنی مانەوەو گوزەران هەیە تا ماوەیەك. ئادەم چەند وشەیەكی وت‌و خوا لێی خۆش بوو، چونكە خوا پەشیمانی قبوڵ دەكات‌و زۆر بەبەزەییە.

گوتمان: هەمووتان دابەزن، هەركاتێك لەلایەن منەوە ڕێنموویتان بۆ هات هەر كەسێك شوێنی بكەوێت ئەوا نە ترس ڕووی تێدەكات‌و نە دڵگرانیش دەبێت. هەر كەسێكیش كافر دەبێت و باوەڕ بە ئایاتی خوا ناكات ئەوانە هاوەڵی ئاگر دەبن و تیایدا بەهەمیشەی دەمێننەوە".

سورەتی ئاڵ عمران: "إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحاً وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ (٣٣) ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٣٤)".

"إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ"(آل عمران: ٥٩)، واته:" بەڕاستی خوا هەڵیبژاردووە ئادەم‌و نوح‌و خێزانی ئیبراهیم و خێزانی عیمران بەسەر جیهاندا، نەوەكان هەندێكیان لە هەندێكی تریان، خوای گەورە بیسەرو زانایە".

"وێنەی عیسا لای خوا وەك ئادەم وایە كە لە خۆڵ دروستی كردو پاشان فەرمووی: دروستبە، یەكسەر دروست دەبێت".

سورەتی المائدة:

"وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَاناً فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٢٧) لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ (٢٨) إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاء الظَّالِمِينَ (٢٩) فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٣٠) فَبَعَثَ اللّهُ غُرَاباً يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ (٣١) مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً وَلَقَدْ جَاءتْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيراً مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ (٣٢)".

واته:" ئەی موحەممەد بخوێنەوە بەسەر گەلەكەتدا هەواڵی ڕاستی دوو كوڕەكەی ئادەم، هەر یەكێكیان قوربانیەكیان كردو خوا لە یەكێكیان وەرگرت‌و لەوی تری وەرنەگرت وتی: من تۆ دەكوژم، براكەی وتی: بەڕاستی خوا تەنها لە پارێزكاران (متقین) وەردەگرێت, ئەگەر دەستم بۆ درێژ بكەیت بۆ كوشتنم من دەست درێژی ناكەمە سەرت، من لە خوای

جیهانیان دەترسم، من دەمەوێت تاوانی منو خۆیشت هەڵگریتو ببیتە هاوەڵی ئاگرو ئەوەش سزای ستەمکارانە. نەفسی، کوشتنی براکەی لا جوان کردو براکەی کوشت، بوویە یەکێك لە خەسارەتمەندەکان، خوای گەورە قەلە ڕەشێکی نارد دەگەڕا بەسەر زەویدا تا فێری بکات تەرمی براکەی داشارێت، بکوژەکە وتی: داماوی بۆ من ئایا ناتوانم وەك ئەو قەلەڕەشەیە تەرمی براکەم بشارمەوەو لە پەشیمان کاران بوو, لەبەر ئەمەیە لەسەر نەوەی ئیسرائیلمان نووسی کە هەر کەسێك بە ناهەق کەسێکی تر بکوژێتو خراپەکار بێت" وەك ئەوەیە هەمو خەڵکانی کوشتبێتو هەر کەسێکیش نەفسێك بژێنێتەوە وەك ئەوەیە هەمو خەڵکی ژیانبێتەوە. بەڕاستی پەیامبەرانی ئێمەیان بۆ ڕۆیشتوەو زۆربەشیان پاش ناردنی پەیامبەران زیادەڕۆ بوون".

سورەتی الاعراف:

"وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ (١١) قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ (١٢) قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ (١٣) قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٤) قَالَ إِنَّكَ مِنَ المُنظَرِينَ (١٥) قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ (١٦) ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ (١٧) قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْؤُوماً مَّدْحُوراً لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ( ١٨) وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (١٩) فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ (٢٠) وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ (٢١) فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَآنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ (٢٢) قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٢٣) قَالَ اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (٢٤) قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ (٢٥) يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشاً وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (٢٦) يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ (٢٧)".

واتە:" ئێمە ئێوەمان دروستکردو پاشان ئێوەمان نەخشاند، پاشان بە فریشتەکانمان وت: سوجدە بەرن بۆ ئادەم، هەموویان سوجدەیان برد ئیبلیس نەبێت لە کڕنوش بەران نەبوو, فەرمووی: چی تۆی مەنعکرد لە کڕنوش بردن کاتێك فەرمانم پێکردن شەیتان وتی: من لەو باشترم، منت لە ئاگر دروستکردو ئەویشت لە قوڕ دروستکردووە.

فەرمووی: دابەزە لەوێ، بۆت نییە خۆ بەزل بگریت لە ناویدا دەرچۆ، تۆ لە زەبوون و سەرشۆڕەکانیت، وتی: مادامێك منت دەرکرد، بۆیان دەچمە کەمینەوە، ڕێگەی ڕاستی تۆیان لێدەگرم, لە پشتو پێشو لای ڕاستو لای چەپەوە بۆیان دێم، ئەو کات نابینی زۆربەیان سوپاسگوزاربن. فەرمووی:" دەربچۆ لەوێ بە دۆڕاویو بێزراوی، بۆ ئەوانەی لە مرۆڤ شوێن تۆ دەکەون جەهەنمتان لێپڕ دەکەم. ئەی ئادەم خۆتو ژنەکەت لەبەهەشتدا بنو هەرچی ئارەزوو دەکەن بیخۆنو نزیك ئەو درەختە مەکەون ئەگەرنا لەستەمکاران دەبن. شەیتان وەسواسەی بۆ دروستکردن بۆ ئەوەی عەوراتیان پاش دیار نەبوون دەربخات وتی: خوا ئەو درەختەی لێ مەنع کردن تەنها بۆ ئەوەبوو نەبنە دوو فریشتە، یان نەبن بە نەمرەکان سوێندی بۆ خواردن بە خوا کە دڵسۆزیانە، ئەوانی بەسەرکەشی خۆی لادا، کاتێك تامی درەختەکەیان کرد عەوراتیان دەرکەوتوو یەکسەر پەلاماری گەڵاکانی درەختەکانی بەهەشتیانداو خۆیان پێدادەپۆشی، خوای گەورە بانگی کردن، ئایا ئاگادارم نەکردن لەو درەختەو پێم نەوتن شەیتان بە ڕوونی دوژمنی ئێوەیە. وتیان خوایە ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد ئەگەر لێمان خۆش نەبیتو بەزەییت بە ئێمەدا نەیەتەوە لە خەسارۆمەندانین, فەرمووی: دابەزن لەوێ هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنە، بۆ ئێوە لەزەوی دا جێی حەوانەوە هەیە تا ماوەیەك. فەرمووی: لەوێ دەژینو لەوێ دەمرنو لەوێش دەردەهێنرێنەوە. ئەی نەوەکانی ئادەم ئێمە دامان بەزاند جلو بەرگ پەڕ بۆ ئێوە، بۆ داپۆشینی عەوراتتان بەرگی خۆپارێزی (التقوی) زۆر باشە ئەوانە لە ئایاتی خواین، بەڵکو بە یادبن، ئەی نەوەی ئادەم شەیتان سەرسامتان نەکات

هەروەك چۆن باپیرە و داپیرەی ئێوەی لەبەهەشت دەرکردو لێی کردنەوە بەرگەکانیان بۆ دەرخستنی عەورەتیان شەیتان‌و دارو دەستەکەی ئێوە دەبینین, ئێوە ئەوان نابینن ئێمە شەیتانمان کردووە بەدۆستی ئەوانەی کە بێباوەڕن".

سورەتی الاسراء:

"وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إَلاَّ إِبْلِيسَ قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً (٦١) قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَـذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إَلاَّ قَلِيلاً (٦٢) قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَاء مَّوْفُوراً (٦٣) وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلادِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً (٦٤) إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً(٦٥)".

واتە:" کاتێك بەفریشتەکانمان وت کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم کڕنوشیان برد، ئیبلیس نەبێت وتی: ئایا کڕنوش بەرم بۆ کەسێك لە قوڕ دروستت کردووە, ئەوەی کە ڕێزت بەرز کردەوە بەسەر مندا ئەگەر بمهێڵی تا قیامەت هەموو نەوەکانی ڕاپێچ دەکەم، کەمێکیان نەبێت کە نەتوانم، فەرمووی: بڕۆ هەر کەسێك شوێنت کەوت جەهەنم پاداشتیان بێت پاداشتێکی تێرو تەسەل, ئارامییان لێهەڵگرە ئەوانەی دەسەڵاتت هەیە بەسەریاندا، بەدەنگت و بەسوارەکانت و هاوبەشیان بکە لە ماڵ‌و منداڵداو بەڵێنیان بدەرێ، شەیتان تەنیا بەڵێنی درۆ دەدات. بەندە ڕاستەکانی من دەسەڵاتت نییە بەسەریاندا بەسە خوا وەکیل بێت".

سورەتی (الکهف):

"وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاء مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلاً (٥٠) مَـا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً (٥١)".

واتە:" کاتێك وتمان بە فریشتەکان کڕنوش بەرن کڕنوشیان برد، ئیبلیس نەبێت لە جنۆکە بوو لە ڕێگەی خوا لایدا، ئایا خۆی و نەوەکانی دەکەن بە گەورەو پاڵپشتی خۆتان جگە لە خوا؟ ئەوان دوژمنی ئێوەن، چەند ئاڵوگۆڕێکی خراپە بۆ ستەمکاران. من پێشانی ئەوانم نەداوە دروستکردنی و ئاسمانەکان‌و زەوی‌و دروستکردنی خۆیان، من گومراهەکان ناکەمە هاوکار.

سورەتی طه: "وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً (١١٥) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى (١١٦) فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى (١١٧) إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى (١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى (١١٩) فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى (١٢٠) فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى (١٢١) ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى) (١٢٢) قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعاً بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى (١٢٣) وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤)". واتە: "ئامۆژگاری ئادەممان کرد لە پێشداو بیری چوویەوە، نەمانبینی ئادەم پێداگری لەسەری. کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنوش بەرن کڕنووشیا ن برد، ئیبلیس نەبێت نەیبرد، وتمان ئەی ئادەم ئەمە دوژمنی تۆو ژنەکەت لەبەهەشت دەرتان دەکات ئەو کات تۆ بەدبەخت‌و ماندو دەبیت، بۆ تۆ هەیە برسیت نەبێت لە بەهەشتداو ڕەش‌و ڕووت نەبیت، تۆ تینو نابیت تیایداو گەرمای خۆر لێت نادات. شەیاتن وەسوەسەی بۆ دروستکرد وتی: ئەی ئادەم ڕێگەی درەختی نەمریت پیشان بدەم لەگەڵ موڵکێکی نەبڕاوەدا.

لە درەختەکەیان خواردو دەرکەوتن‌و گەڵای درەختەکانیان لە خۆیان دەپێچا، ئادەم سەرپێی خوای کردو خۆی لە خۆی تێکدا, پاشان لە خۆی نزیکی کردەوەو لێیخۆشبوو ڕێنموونیکرد, فەرمووی دابەزن هەمووتان، هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنە، کاتێك ڕێنموونی منتان بۆ هات هەر کەسێك شوێنی بکەوێت گومڕا نابێت‌و بەدبەخت نابێت، هەرکەسێکیش پشتی کردە یادی من بۆ من هەیە ژیانێکی کولەمەرگی‌و بەکوێریش کۆیدەکەینەوە.

خوێنەری بەڕێز سەیر بکە بەهەموو هەڵقەکان چیرۆکەکەی ئادەم تەواو دەبێت‌و هەر هەڵقەی باسی گرنگ‌و تازەی تێدایە بۆ نەوەکانی ئادەم. تەنها ئەو باسەی کە دووبارە کرابێتەوە یان چەند جارگوترابێت ئەوەیە مرۆڤ بزانێت خوا ڕێزی لێگرتووەو فەزڵیداوە بەسەر فریشتەو جنۆکەداو شەیتانیش دوژمنایەتی مرۆڤ پیشەیەتی‌و گوێرایەڵی خوا یان ئیبلیس لە دەستی مرۆڤدایە.

ئایا مەسەلەیەکی چارەنووسساز ئەوەندە ناهێنێ چەندجار خەڵکی ئاگادار بکرێتەوە لەسەری, خوایەکی باڵادەست‌و بێئاتاج بە مرۆڤ ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە ، شایەنی ئەوە نییە گوێڕایەڵی بکرێت‌و سەری نەوازش‌و سوپاسگوزاری بۆ نەوی بکرێت؟ ئیبلیسێکی لوت بەرزو دڵ پڕ لە قین و خراپ شایانی ڕوو ڕەش کردن‌و زەلیل کردن نییە؟

جگە لەو خاڵە هەموو باسەکانی تر تازەن‌و باسی لە هۆی ڕێزگرتن لە ئادەم‌و هۆی سەرکەشی ئیبلیس و هۆی دەرکردنی ئادەمی لەبەهەشت و ئیبلیس لە ڕەحمەتی خواو سیفەتەکانی مرۆڤ و بەزەیی خواو هۆی خوێنڕشتن‌و سەرەنجام‌و سزای خوێنڕشتن‌و ژیانەوەی ئادەمی‌و ڕێگاکانی شەیتان بۆ لە خشتەبردنی خەڵک‌و سیفەتی ژیان لەسەر زەوی‌و ئەوانی تریش هەمووی بەیەکەوە باسەکەی ئادەم تێروتەسەل دەکەن، وەك چیرۆك، ئەگەر باسی پەیوەندی ئەو هەڵقە باسانە بکرێت لەگەڵ ناوەڕۆکی سوورەتەی تیایدا باسەکە هاتووە ئەوەندەی تر ئیعجازی قورئان دەدرەخات. بەڵام باسەکەی ئێمە لێرەدا ئەوە نەبوو، تەنها باسمان لەوە بوو ئایا چیرۆکەکان دووبارەن یان نا؟!!

نووسەری (خوێننامه) گەورەترین‌و زۆرترین لاپەڕەکانی کتێبەکەی داناوە بۆ ئەم باسە، لەگەڵ ئەوەدا لە زانستەکانی قورئانی پیرۆزدا بەشێکی زۆر کەمی هەیەو هەندێ لە زانایانیش وەك د.مصطفى زەڵمی‌و پێش ئەویش ئەبوموسلمی ئەسفەهانیش دان بە نەبوونی دا دەنێن‌و ئەوەی (جمهور الأمة) بە نەسخیان داناوە ئەوان ئەڵێن (تخصیص)ە.

شایانی باسە ژمارەی ئایەتە نەسخ کراوەکان زۆر کەمن‌و چەند ئایەتێکی دیاریکراوە. نەك وەك ئەوەی (زەردەشتی) باسی کردوەو لە ڕێگەیانەوە دەیەوێت گومان لە دڵی خوێنەردا دروست بکات‌و سەرەتای باسەکە تا کۆتایی زانراوێکی باش ناداتە خوێنەر.

٢١. لە لاپەڕە (٦٩) کە سەرەتاکانی باسەکەیە دەڵێت:" نەسخ کورت کراوەی (ناسخ‌و مەنسوخ)ەو ڕاستییەکەی نەسخ کورتکراوەی نییەو بەڵکو چاووگ (مصدر)ە.

٢٢. لە لاپەڕە (٦٨)ەوە بۆ لاپەڕە (٧٥) بەرانبەرکێیەك لە نێوان ناسخ‌و مەنسوخی قورئان‌و کاری وەستاو ئەندازیارو هەر نووسەرێکدا کە هەڵە دەکەن‌و پاشان ڕاستی دەکەنەوە یان کارێکی لاواز دەکەن‌و پاشان بەهێزی دەکەن‌و بێ شەرمی بەرانبەر بەخوا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بڵێت:" هەر دوو حاڵەتەکە یەکێکن‌و هیچ جیاوازییەکیان نییە، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا وەستانی بڕیاری دوێنێیەو کارپێکردنی بڕیارێکی ئەمڕۆیە، لە جیاتی ئەوەی دوێنێ. جا ئەگەر مرۆڤ بێت‌و ئەگەر خوا .."[1].

کاکی ئەمڕۆ زیندوو، سەرەنجام وەك هەموو کەسانی پێش خۆت مردوو لە خوا بترسەو سەیرێکی وردی بکە، ئەو دوو نموونەیە زۆر زۆر دوورن لەیەکەوە, ئەندازیارو وەستاو نووسەرەکە لە هەڵەو لاوازییەوە گۆڕانکاری دەکەن لە بەرهەمەکانیاندا، چونکە خۆیان لاوازن‌و کامڵ نین، بەڵام خوایەکی (زاناو کار دروستی ئاگاداری بە توانا گۆڕانکاری لە چەند ئایەتێکی ئەحکامدا لە نەزانینەوە نییە (پەنا بەخواو پاك‌و بێگەردی بۆخوا) لەوەی تۆ وتوتە.

چونکە خوا خۆی دەفەرموێت:" وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ" (الأنعام: ٥٩). هەروەها لە سورەتی (مریم)دا دەفەرموێت: " وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً"(مریم: ٦٤). سڕینەوەی هەر شتێك‌و سابت کردنی هەرچییەکی تر بە ویست‌و ئیرادەی خوا بووەو خۆیشی دەفەرموێت:" يَمْحُو اللّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ" (الرعد: ٣٩)[2].

بۆ بەرچاوڕۆشنی خوێنەر کەمێك باسی ناسخ‌و مەنسوخی قورئانی پیرۆز دەکەین‌و باس لەوە دەکەین کە نەسخ پەیوەستە بە چ چەمکێك لە قورئاندا‌و هۆکارو حیکمەتەکان چین؟

(نەسخ) زانایان پێناسەیان کردوە بەوەی: بریتیە لە هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعی کە لە پێشدا هاتبوو بە بەڵگەیەکی تری شەرعی دواخراو.

بە پێناسیەکەیدا دیارە کەنەسخ تایبەتە بە ئەحکامەوە، بەڵام ئایەتەکانی تری قورئان کە باس لە بیروباوەڕو خوڕەوشتە بەرزەکان‌و بنچینەکانی خواپەرستی‌و کردەوە بنەڕەتیەکان‌و هەواڵی ئومەتە پێشووەکان دەکات، هەموو ئەمانە نەسخ نایگرێتەوە، زانایان یەك ڕان لەسەر ئەمە[3].

هەروەها بوونی نەسخ لە چەند ئایەتێکی دیاریکراوی ئەحکامدا بەڵگەیە لەسەر واقعی بوونی ئیسلام‌و زانایی‌و گەورەیی خاوەنی ئەم قورئانە، لەلایەکی تریش بەڵگەیە لەسەر پەیامبەرێتی موحەمەد کە تەنها گەیاندنی لەسەر بووەو تا ئایەتەکانی بۆ دانەبەزی بێت نەیزانیوە چی‌و کامە دادەبەزێت.

---

[1] خوێننامه ل ٧٢.

[2] "أصول الاحكام وطرق الاستنباط فى التشريع الاسلامى" ل٣٧٩ دانراوی هەردوو دکتۆر أحمد عبيد كبيسىء صبحى محمد جميل.

[3] لاپەڕە ١٩٥ ج ٢ (مناهل العرفان فى علوم القران).

ئایینی ئیسلام کاتێك خوا ناردویەتی تەنها بۆ خوێندنەوە نییەو بەس، بەڵکو بۆ جێبەجێکردن و کارپێکردنە. ئەو ژیان و بارودۆخەی پێش دابەزینی وەحی هەبوو زۆر زۆر جیاواز بوو لەو سەردەمەی ئیسلام پێکیهێنا لە هەموو بوارێکەوە، ئایینی ئیسلام گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی و گەورەو پێچەوانەی ئاراستەی خەڵکی ئەو کاتە بوو. ئەم گۆڕانکاریی و بەگژاڕچوونە زۆر گران بوو لەسەر خەڵکەکە، ئەگەر خوای گەورە هەمو ئەو گۆڕانکارییە سەختانەی بەیەکجاری داوابکردایە ئەوا بێگومان جێبەجێ نەدەکرا. کارێکی واش لەگەڵ (حکیم، علیم، لطیف)ی خوادا ناگونجێ (پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە)، بەڵام ئاینی ئیسلام کەم کەم و لە ماوەی (٢٣)ساڵدا دابەزیی و خەڵکی ڕادەهێنا بۆ بەرەو لوتکە ڕۆیشتن و پلە بەپلە سەختییەکانی پێدەبڕین و ڕووداوو ساتە گونجاوەکانیش دەبوونە یارمەتیدەر بۆ دابەزینی حوکمی تازە.

هەندێکی کەم لەو حوکمانە (ناسخ) بوون و خەڵکیان دەگواستەوە لە ئاسان بۆ ئاسانترینیان لە ئاسان بۆ لەبارتر. بەو شێوەیە لەو ماوەیەدا ئیسلام کامڵ بوو، لەگەڵ هۆش و دەرونی خەڵکی سەر زەویدا تێکەڵ بوو، هەر تاکێکی ئیماندار قورئانێکی زیندوو بوو دەگەڕا و لە ماوەیەکی کورتدا سەرزەوییان ڕووناك کردەوە و بە یاساو دەستوورێك کە مرۆڤایەتی وێنەی نەدیبوو دەستەوسان لەوەی بتوانێت وێنەی بهێنێ.

بۆ زانین و جیاکردنەوەی ناسخ لە مەنسوخ زانایانی ئوسوڵ (الاصول) چەند مەرجێکیان دانەوە و قسە کردن دەربارەی قورئان بەو هەرەمەکییە نابێت کە لە (خوێننامە)دا هەیە.

مەرجەکانی زانایانی ئوسوڵ ئەمانەن:

١. ئەو دوو بەڵگەیە دژ بەیەك بن و نەکرێت بە هیچ ڕێگەیەك کۆبکرێنەوە.

٢. نەسخکراو لە حوکمە فەرعییەکان بێت.

٣. لە ڕووی کاتی دابەزینەوە ناسخ پاش مەنسوخ هاتبێت.

٤. ناسخ و مەنسوخیش وەك یەکبن لە ڕووی هێزی بە بەڵگە ڕاگرتن.

٥. حوکمەکە وشەیەکی لەگەڵدا نەبێت بەڵگە بێت لەسەر نەسخ نەبوونی، وەك وشەی (أبدا) یان (الی یوم القیامە).

٦. بەڵگەیەکی ڕاست و دیار هەبێت لەسەر نەسخ بوونی.

٧. حوکمی نەسخ دەقی لەسەر هاتبێت.

ئەگەر ئەم پێناسەو مەرجانە بەسەر (خوێن نامە)دا جێبەجێ بکەین زیاتر لە (٩٥٪)ی ڕاست دەرناچن و کەمێکی تریش بە ترش و خوێکانی (زەردەشتیی)ەوە دەڕۆن و ئەوەی دەمێنێەوە دەبێتە بەڵگە لە سەر حەکیمی خواو پێغەمبەرێتی موحەممەد ﷺ.

٢٣. لە لاپەڕە (٧٢)دا دەڵێت:" بە هەمان شێوە دوێنێ خوا بڕیارێك دەردەکات کە کەس بەسەرخۆشی نوێژ نەکات، بە لام کاتەکانی دیکە قەیناکات بۆ بەیانی خوا دەڵێت: ئەم بڕیارە لەگەڵ ئەنجامدا ناگونجێت و بڕیار دەدات کە مەشروب و هۆکارەکەی (سەرخۆشی) حەرامن و نابێت لە هیچ کاتێکدا بخورێتەوە. بەم حاڵەتەش دەڵێن نەسخ".

لە کوێی قورئان و فەرموودەشدا هاتووە کە خوا دەڵێت: ئەم بڕیارە لەگەڵ ئەنجامدا ناگونجێت، بۆ بوهتان بەدەم خوایشەوە دەکەیت، وتنی ڕستیەکی وا زۆر قورسە ئەگەر نازانێت.

پلە پلەیی (التدرج) لە حەرامکردنی مادە سەرخۆشکارەکاندا نیشانەی گەورەیی قورئان و خاوەنەکەیەتی، لای (زەردەشتی)و کەسی تریش شاراوە نییە کە وڵاتانی جیهان چەندە دەناڵێنن و گیرۆدەن بەدەست مادده سەرخۆشکارەکانەوەو دەستەوسانن لە قەدەغەکردنی و ڕێگا[1] نەما نەیگرنە بەر کەچی هەر لە زیادبووندایە، بەڵام ڕێگاکەی قورئان کە "تدرج" بووە لە قەدەغەکردنیدا زامنی ئەنجامەکە بوو، پاش کۆتا ئایەتی و پلەی قەدەغەکردنەکە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کەس نەما وازی نەهێنابێت، لەگەڵ ئەو هەموو حەزو ئارەزووە مودمن بوونەشیاندا، مرۆڤی مەست

1- مەبەستمان لە ڕێگای "ڕاگەیاندن و پزیشکی و پۆلیسیە".

بوو بەو مادانە ناتوانێت لەپڕو بە یەکجار وازی لێ بهێنێت، چونکە تێکەڵ بە خوێنی دەبێت و کار لە هەستو هۆشی دەکات. بۆیە خوای کار دروست بەو شێوەیە پلە بە پلە و لە ماوەیەکی دیاریکراودا بە یەکجاری لێی قەدەغە کردن.

هۆی مانەوەی قۆناغەکانی قەدەغەکردنەکەش لە قورئاندا ئیشارەتە بۆ چاکخوازانی ناو مرۆڤایەتی کە چۆن هەنگاو بە هەنگاو گرفتە سەختەکان چارە بکەنو حیکمەت بە کاربهێنن.

٢٤. لەلاپەڕە (٧٧)دا پاڵپشت بەو چەمکەو زۆربەی ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا نەنووسراون، بەم پاساوە" واتەلەبەر ئەوەی کە مەنسوخە" شەرعیەت بە نەبوونی ئایەتەکە لە قورئاندا دەدەن. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەمە ڕای زانایانی ئیسلام بێت کە هەرواش بووە, دەقاو دەق ئەوە دەسەلمێنێت کە سەلەفیەکان بوختان دەکەن, یان هەر خۆیان ئیدعای ئەوە دەکەن کە قورئان تەحریف کراوە.. خۆیان بۆ خۆیان باس لەوە دەکەن کە قورئان تەحریف نەکراوە، کەچی لەو لاشەوە چەندین ئایەتو حوکمی شەرعی دەهێنن کە لە قورئاندا نەنووسراوەتەوە و حوکمەکەی جێبەجێ دەکەن.."

ئەوە سەلەفیەکان نین کە دەڵێن قورئان پارێزراوە لە هەموو گۆڕانێك (تحریف)، بەڵکو خوا خۆی بڕیاری پاراستنی داوە و موسڵمانانیش هەموویان بێگومانن لە بڕیارەکانی خوا کە جێبەجێکراوە، خوا دەفەرموێت:" إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ" (الحجر: ٩). ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندوە و خۆشمان بۆ ئەو قورئانە پارێزەرین. لە پێشەوە باسمانکرد کە دابەزینو نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان چۆن بووەو خوای گەورە چۆن بە هۆی هاوەڵانی زیرەكو بلیمەتی پەیامبەرەوە پاراستی"سوپاس بۆ خوای گەورە".

لە کوێدا یەك زانای ئیسلامی باسی (تەحریف)ی قورئانی کردبێت؟ باسی بکە، تا قیامەتیش مۆڵەتت بێت. ئەگەر کەسێ بیتوانایە دەستکاری قورئانی بکردایە ئەوا هەر لەزوووە کرابوو، یان ئێستا بەم هەموو دوژمنایەتی کردنەی دەیانکرد, چونکە نەهێنی مانەوەی موسڵمانان و نوێبوونەوەیان لە هەموو چەرخو زەمەنێکدا قورئانەکەیانە.

ئەو حوکمە شەرعیەش کە موسڵمانان کاری پێدەکەنو لە قورئاندا نەنووسراوە ئەوە بێگومان لە سوننەتو فەرموودەکانی پەیامبەرەوە ﷺوەرگیراوە، کە ئەویش سەرچاوەی دووهەمی وەرگرتنی ئیسلامەو خوا خۆی فەرموویەتی:"وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)"، پەیامبەر لە ئارەزووی خۆیەوە هیچ ناڵێت، ئەوەی دەیڵێت وەحی خوایە، یان دەفەرموێت:" وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا"(الحشر٧). یان "يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ" و چەندەها ئایەتی تر کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سوننەت و فەرموودەکانی پەیامبەر کاری پێدەکرێت.

لە نێوانی قورئانو سوننەتی پەیامبەریشدا گونجاوییەکی تەواو هەیە, ئیمامی شافیعی دەڵێت:" لە هەر شوێنێکدا نەسخی ئایەت کرا بە سوننەت ئەوا ئایەتێکی تر پشتی ئەو نەسخە دەگرێتو لەهەر شوێنێکیشدا نەسخی سوننەت کرا بە ئایەت ئەوا سوننەتێکی تر پشتی ئەو نەسخە ئەگرێت"[1].

٢٥. (خوێننامە) لە لاپەڕە (٨٢)دا تەفسیری ئایەتێك بە هەڵە دەکاتو دەڵێت :"وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً) (النحل: ٦٧)". بە پێی ئەم ئایەتە گیراوەی ترێ کە دەکاتە شەرابو یەکێکە لە مادده سەرخۆشکارەکان خواردنەوەی حەڵاڵە، هەروەها گیراوەی خورماش کە دەکاتە عەرەق بە هەمان شێوە..!!"

وشەی سەرخۆشکەر (سکر) لە ئایەتەکەدا بە ڕوونی دیارە و بەڵکو ئەم جۆرە بە ڕزقێکی باش دانراون نەك خراپ.. تەفسیری ئایەتەکەی بەهەڵە کردوەو ڕاستەوخۆ لە تەفسیرە هەڵەکە حوکمی وەرگرتووە.

ڕاستی تەفسیری ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: "وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً (النحل: ٦٧). "لە بەرهەمەکانی خورماو ترێ وەریدەگرن مادە سەرخۆشکەرەکانو ڕزقی چاك". ئەم ئایەتە پیرۆزە حاڵی خەڵکی ئەو کاتە باس دەکات (واتە پێش حەرامکردنی مادە سەرخۆشکەرەکان) بە موسڵمانانو غەیرە موسڵمانەوە کە لە خورماو ترێ مادە

[1] ـ الاتقان فی علوم القران ج٢ ل٢٧ ط ١٩٧٨.

سەرخۆشکەرەکان‌و ڕۆژی چاك دروست دەکەن کە " سرکەو دۆشاوی خورماو کشمیش‌و مێوژە", ڕۆژی چاکەکان ئەمانەن نەك ئەوەی (زەردەشتی) حەزدەکات وابێت.

" سکرا ورزقا حسنا" دووشتی جیاوازن‌و (و)اوی عەتف لە نێوانیاندا هاتووە. ئەمەش هەڵەیەکی تری گەورە بوو کە پەیوەندی بە نەزانینی نووسەرەوە هەبووە دەربارەی تەفسیرو ڕێزمانی عەرەبی".

٢٦. لە لاپەڕە (٨٤) دا دەڵێت:" ئەگەر بە مێژووی شەریعەتی ئیسلامیدا بچینەوە دەبینین بە فەرموودەی پەیامبەر هەندێك لە حوکمی ئایەتەکان وەستێنراوە.. !! واتە بەفەرمودە (الحديث) ئایەت مەنسوخ کراوە، باشترین نموونەش بۆئەم مەسەلەیە ئایەتی (١٥)یە لە سورتی (النساء) دەڵێت:" ئەو ژنانەی بە کاری بەدڕەوشتی هەڵدەستن پاش ئەوەی چوار شاهیدی لەسەر دەگرن لە ماڵەکانیاندا بەندیان بکەن، تامردن زەفەریان پێدەهێنێت یان ئەوەتا خوای گەورە چارەیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە". کاتی خۆی بەم حوکمە هەر ئافرەتێك بەدڕەوشتی بکردایە لە ماڵەکانیاندا زیندانیان دەکردن هەتا مردن, تا ڕۆژێك پەیامبەر وتی:" لێم وەرگرن، خوا ڕێگە چارەی بۆ دۆزینەوە, ئەگەر کچ بوون سەد جەڵدیان لێبدەن, ئەگەر خاوەن مێرد بوون ڕەجمیان بکەن.. بە هەمان شێوە ئایەتیش بۆ وەستانی حوکمی ئایەتی (١٥و ١٦)ی هەمان سوورەت هاتووە".

پاشان دەڵێت:" نموونە بۆ ئەم جۆرە نەسخە زۆرەو ئێستا هەمووی دیاری دەکەین, بەڵام پێش ئەوە دەمەوێت مەبەستی سەرەکی ئەم بەشە لەم نوسینەمدا ڕوون بکەمەوە: "پاشان زەردەشتی لە لاپەڕەکانی ٨٥و٨٦و٨٧و٨٨ زۆر بە نادیاری مەبەستەکەی دەگەیەنێت و باسی بانگەوازەکەی پەیامبەرو هۆکاری دژایەتیکردنی بانگەوازەکە دەکاتە دوو هۆکار:

١.. دەرکەوتنی بانگەوازەکەی پەیامبەر زۆر تەقلیدی بووە.

٢.. خەڵکی ئەو ناوچەیە بە تایبەت شاری مەکە کە پێگەیەکی بازرگانی گەورە بووە پێویستیان بە دامەزراوەیەك هەبووە تا کاروباری سیاسی‌و ئابووری‌و پاشان کۆمەڵایەتی بەڕێوەببات..و بانگەوازەکەی پەیامبەر لەم خاڵەشدا هەر بە بۆشی مابوویەوە.

بۆ وەڵامی ئەو قسەیەت کە دەڵێیت: "فەرمودە حوکمی ئایەتی قورئانی نەسخ کردووە" ئەوە لە قسەکەی ئیمامی شافیعی کە لە پێشەوە باسمان کرد بەتاڵ هێنانی نموونەکەت و مەبەست‌و ئەوەیشی پێت ڕوونکردوەتەوە دەردەکەوێت.

پەیامبەر ﷺ هیچ کات لە خۆیەوە حوکمی ئایەتی نەسخ کردووە و ئەگەر نەسخ هاتبێت بەو شێوە کەمەو بەو مەرجە زۆرانەی کە باسمان کرد ئەوا هەر بە ئایەت بووەو فەرمودەکانی پەیامبەر ڕاڤەو تێگەیشتنی پەیامبەر ﷺ بووە بۆ ئایەتە پیرۆزەکان.

هەرچەندە بەتاڵی بناغەی ئەم مەبەست‌و باسەی (زەردەشتی) دەکەوت، بەڵام باسی هۆکارەکانی دژایەتیکردنی پەیامبەر ﷺ وەك باسێکی سەربەخۆ وەڵام دەدەمەوە و ڕاستی و ناڕاستی دەردەخەم.

لە باسی هۆکاری یەکەمدا ڕاستە کە دەڵێیت بانگەوازەکەی وەك هەموو پەیامبەرانی‌تر دەستی پێکرد و خەڵکی نامۆنە بووە بەو شێوە بانگەوازانە، ئەمەش لەوتەکەی وەرەقەی کوڕە نەوفل دا دەردەکەوێت: کە پێی وت: ئەوە جوبرەئیلە هاتووە ئەو فریشتەی خوا دەینارد بۆلای موسا، خۆزگە گەنج و بە توانا دەبووم زیندو دەبووم کە گەلەکەت دەرت دەکەن، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا گەلەکەم دەرم دەکەن؟، وەرەقە وتی: بەڵێ، پیاوێك نەبووە وەك تۆ بوو بێتە پەیامبەرو دوژمنایەتی نەکرابێت، ئەگەر بگەمە ئەو ڕۆژە زۆر بەهێزانە پشتت دەگرم‌و سەرت دەخەم، پاش ئەوە وەرەقە مرد.."[1].

کەواتە هەموو پەیامبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) بانگەوازەکەیان وەك یەك دەستی پێکردووەو خەڵکیان بانگکردوە بۆ ناسینی خوا بە تاك‌و تەنهایی و بیری مرۆڤیان ڕۆشنکردۆتەوە، پاشان بڕیارەکان دەرچووە بۆ بوارە جیاجیاکانی ژیان.

بەڵام ئەوە نارەوایە بانگەوازی پەیامبەران (سەلامی خوایان لێ بێت)و موحەممەد پێغەمبەر ﷺ بکەیتە هاوەڵی (حەنظە لەی کوڕی صەفوان)و (خالد بن حصان)و (عامر العدوانی)و (عبدالله القضاعی)و (قیس بن ساعدە الایادی)و

---

1- الرحیق المختوم، مبارکفوری ـ باسی دابەزینی وەحی.

وتاربێژەکان و موسەیلەمەی درۆزن. دەڵێیت "ئەمانە هەمان باس و بانگەوازیان هەبووە و خەڵکی لە ئایینە ئاسمانییەکانی ترەوە گوێبیستی چەندین ئەفسانەی لەو شێوەیە بوون".

ئەگەر ئەمانەی تۆ باسیان لێوە دەکەیت هاوشانی موحەممەد پەیامبەر بن ئەی بۆ دژایەتیکردنی ئەوان بە شێوەی دژایەتیکردنی موحەممەد پەیامبەر نەبوو؟ ئەی بۆ نەیانتوانی بەگژ دەسەڵاتداران و چەوسێنەران و مافخۆرانی ئەو کاتەدا بچنەوە؟ بۆ نەیانتوانی دەستورو یاسا بۆ ژیانی خەڵکی دابنێن؟ ئەی بۆ نەیانتوانی کۆیلەو بەندەکان ڕزگار بکەن؟ خەڵکی بخەنە یەك ئاست لە مافی مرۆڤایەتی هەموو تاکێك لە سایەیاندا هەست بەڕێزو کەسێتی خۆی بکات؟

وەك چۆن موحەممەد پەیامبەر ﷺ هەموو ئەوانەی بە زیادەوە کردووە؟!! ئەوانە کەسیان هاوشانی پەیامبەر نین، بەڵکو ئەوانەی هاوشانی پەیامبەرن ﷺ، پەیامبەرانی تری وەك (ئیبراهیم و نوح و عیساو موسا)ن کە هەمانکاری ئەمیان کردووەو خەڵکیان ئاشنا کردوە بە خودی خۆی و خاوەنەکەی و خەڵکیان تێگەیاندوە کە مرۆڤ زۆر لەوە بەڕێزترە کە ماوەیەکی کەم بژی و پاشان ناوی بکوژێتەوە، بەڵکو دەبێت لە نەبوون و بۆ بوون بوونێکی ترو بۆ بوونێکی نەمری خۆی ئامادە بکات.

دەبێت مرۆڤ بزانێت زانست و زانیاری هۆی ڕێزدارییەتی (وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا..)و دەبێت بخوێنێت و هاوڕێی قەڵەم بێت :"اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤)".هۆکاری دژایەتییەکە ئەوەیە کە وەك پەیامبەرانی تر دەستی پێکرد، دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەش دەیانزانی ئەم چەند مەترسیدارە بۆ سەر دەسەڵات و تاکڕەوی ئەوان، بە کۆیلەکردنی کەسانی هەژارو قەرزدارو بێ عەشیرەت و جیاوازی چینایەتی نامێنێت و خەڵکی یەکسانن لەبەردەم خواداو " الناس سواسية كاسنان المشط .."، "كلكلم من أدم وادم من تراب.."، دەسەڵاتداران دەیانزانی ڕەگەزپەرستی و حوکمی تاکڕەوی نامێنێ و گەورەیی دەچێتەوە دەستی کەسێك کە مرۆڤ نییە تا لایەنگیری ڕەگەزەکەی یان چین و زمانەکەی خۆی بکات.

" لااله الا الله" ئەم وشەیە بوو کەدەسەڵاتداران و گەورە پیاوانی قوڕەیش لێی دەترسان و پەیامبەریش جەختی لەسەر چەسپاندنی ئەو وشەیە دەکرد، ئەوانیش ئامادە بوون لە هەموو شتێك دابەزن (تنازل) بکەن، بەڵام ئەو وشەیەیان نەوت.

سەیری ئەم بابەتە بکە لای هەموو مێژوونوسان ئەم ڕاستییە بەڕوونی دیارە.

ب ـ هۆکاری دووهەم: خاوەنی (خوێن نامە) لە لاپەڕە (٨٧)دا دەڵێت: "دژایەتیکردنی بانگەوازەکەی پەیامبەر لەبەرئەوە بووە کە خەڵکی ئەو ناوچەیە، بە تایبەت شاری مەککە پێگەیەکی بازرگانی گەورە بووە.. پێویستیان بە دامەزراوەیەك هەبووە. تا کاروباری سیاسی و ئابووری و پاشان کۆمەڵایەتییان بۆ بەڕێوە ببات، بانگەوازەکەی پەیامبەر لەم خاڵەشدا هەر بە بۆشی مابوویەوە، لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانیدا هیچ چارەسەرێکی بۆ ئەم کێشەیە ناو خۆییانەی پێنەبووە..".

ئەمە پێچەوانەی ڕاستییە، شاری مەککەو دەوروبەری کێشەی ئابووری و بەڕێوەبردنیان نەبووە، بەڵکو شارێکی ئاوەدانی فراوانی خۆشگوزەران بووە، لە چاو شارەکانی تری ئەو سەردەمەدا، خەڵکی لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکردو بازرگانی ڕێکخراویان هەبووە لەگەڵ شام و یەمەندا. وەرزی ئاڵوگۆڕی بازرگانیان بەناو بانگ بووەو لەم ڕووەوە چەند جاربووەتە جێگەی تەماعی داگیرکاران و لە مێژوودا ساڵی (فیل) شایەتی پێشکەوتنی لایەنی ئابووری و خۆشگوزەرانی خەڵکی شاری مەککەیە.

هۆی ئەوەش کە لەمەکەدا پەیامبەر ﷺ باسی بازرگانی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی نەکردووە:

یەکەم: لەبەرئەوەبوو کە پەیامبەر تەنها گەیەنەرە لەلایەن خواوەو باسکردنی شتێك یان باس نەکردنی تەنها پەیوەندی بە خواوە هەیە.

دووهەم: خوای گەورە کاری بێ حیکمەت ناکات، باسێك کە کاتی نەهاتبێت و شوێنی پێویستی خەڵکی نییە باسی ناکات.

جگه له مانەش گۆڕانكاری كاتێك بەهێزو بەردەوام دەبێت كه له ناخ و بیری تاكەكانەوه دەست پێبكات و پاشان ئەو تاكانه ئامادەی هەموو جۆره گۆڕانكارییەكی دەرەكیش دەبن.

(زەردەشتی) بەبێئەوەی بیەوێت لەو باسەدا وەسفێكی جوانی تەعالیمەكانی ئیسلام دەكات كه به هۆی ئەو تەعلیمانەوه خەڵكێكی زۆر له ئیسلام كۆبوونەوه[1].

٢٧. له لاپەڕه (٨٨و٨٩)دا (زەردەشتی) (٣٤)و نمونه دەهێنێت كه له ناو قورئاندا هاتوون باس له برایەتیو خۆشەویستیو لێبووردەییو ئاشتیو ئارامگرتنو هەروەها سیفەتەكانی خوا له لێبووردەییو بەزەیی ..و سیفەتەكانی پەیامبەر له مژدەدەرو ترسێنەرو .. قسەی كافرەكان نابێتو موسوڵمانەكان دڵگران بكات..

دەڵێت "له ژێر كاریگەری ئەم ئایەتانه خەڵكانێكی زۆر شوێنی كەوتنو ورده ورده یاساكانی دەركەوتن..!! تاوای لێهات ئایەتەكان دەخالەتیان له بچووكترین ڕەفتاری موسڵماناندا دەكرد..

پاشان له لاپەڕه (٩١)دا دەڵێت: "له دوای شەڕەكانی بەدرو ئوحودو ڕێككەوتنی حودەیبییه تێڕوانینی بۆ یاساو دەقەكان گۆڕاو له جیاتی برایەتی دوژمنایەتیو له جیاتی لێبووردن زۆرو له جیاتی پشت هەڵكردن ڕووبەڕووبوونەوه..".

خوێنەری بەڕێز ئەو تەعالیمو ئایەتانەی كه (زەردەشتی) شایەتی ڕاستیو جوانیان بۆ دەدات هیچیان نەسخ نەبوونەو وەك خۆیان ماونەوەو دەمێننەوه تا قیامەت.

پێناسەی نەسخ كه بریتیه (له گۆڕینو لابردنی حوكمێك به حوكمێكی تر) زۆربەی ئەو سیو چوار نموونەی تۆ باست كردوون (حوكم) نینو نەسخ نایانگرێتەوه، هەركەسێكیش بڵێت نەسخ بوون به هەڵەدا چووه. باسی سەرچاوەكەشت نەكردووه!!

زۆربەی ئەوەی باستكردووه یان ڕەوشته بەرزەكانن یان سیفەتی پەیامبەرن یان سیفەته پیرۆزەكانی خوای گەورەن كه نەسخ نایانگرێتەوەو تەنانەت لەناو ئایاتی ئەحكامدا زۆر بەكەمیو لەبەر چەند حیكمەتێكی خوایی ڕوویداوه وەك له پێشەوه باسمانكرد.

كاتێك باس له بوونی باسەكانی كوشتنو خوێنو شەڕەكان دەكەیت كه له قورئاندا هاتووەو ناتوانیت بڵێیت بەم باسانه باسەكانی ئاشتیو خۆشەویستی نەسخ كردووه، بەڵكو ئاشتیو برایەتیو خۆشەویستی له جێگەی خۆیداو شەڕو كوشتارو تۆڵەش له جێگەی خۆیدا.

كوا له دونیادا كێ هەیه یان كێ بووه جیاوازی ئەو دوو حاڵەتەی نەزانیبێت؟ بوونی ئەو باسانەش له قورئاندا دەگەڕێتەوه بۆ چەند هۆیەك، لەوانه:

١. لەبەر بوونی ئەو دژایەتییه گەورەیەی دەكرا له لایەن خاوەن بەرژەوەندییەكانی ئەو سەردەمەو گەوره پیاوانی قوڕەیشو یەهودیەكانیش خۆ دژایەتییان سەری كردبوو؟

٢. ئایینی ئیسلام دەستورێكی گشتگیره و هەمەلایەنه حوكمی شوێنكەوتوانی دەكات.

هیچ یاساو دەستوورێك نییه باس له سزای تاوانكارانو بەرەنگاریی دەستدرێژكاران نەكات، ئەگەر یاسایەك هەبێت ئەو باسانەی تێدا نەبن ناتەواونو حوكمی خەڵكانی سەر زەوی پێناكرێت.

٣. مرۆڤ به سروشتی خۆی سەركەشەو به هەمیشەیی حەز به سنوور بەزاندنو خوێنڕشتن دەكاتو بوونی ئەم باسانەش له قورئاندا بۆ سنووردانانه بۆ ئەم سەركەشیەی مرۆڤو ژیانی ڕێكدەخات كه تەنها بۆ حاڵەتەكانی بەرگری له خۆكردنو بەرپەرچدانەوەی ستەمو زەرورەتەكانی تر بەكاری بهێنێتو ئەو ئارەزووی خراپەی تێدا خامۆش بكات.

٢٨. لەلاپەڕه (٩٨)دا دەڵێت: "مەسەلەی نەسخ له قورئاندا گرنگی خۆی هەیەو باس نەكردنو ئبرازنەكردنی ئەم مەسەلەیەش لەلایەن ئیسلامییەكانەوه دەگەڕێتەوه بۆ ئەوەی ڕووی ڕاستەقینەی دەسەڵاتو سیاسەتی ئیسلام دەردەخات، ئەمەش له بەرژەوەندییان نییەو هەڵدانەوەی ئەم پەردەیەش بۆ زانینه زیاتر لەوەی بۆ تێگەیشتن".

[1] - خوێننامه لاپەڕه ٩٠.

موسڵمانان شتێك نییه له ئیسلام دا ئیبزاریان نەکردبێت، یان شەرم له ئبراز کردنی بکەن، مەسەلەی نەسخیش لەگەڵ کەمی باسەکەدا خوا له قورئاندا به چەند ئایەتێك باسی فەرمووەو موسڵمانان هەمیشه له دەورکردنەوەی قورئانەکەی خوادا دەیخوێننەوەو پاداشتیش لەسەر خوێندنەوەکەی وەردەگرن.

له هەموو تەفسیرەکانیشدا تەفسیری ئەو ئایەتانه کراوەو پەڕاوه فقهییەکانیش باس له حوکمی ناسخەکان‌و مەنسوخەکانیش دەکەن، له هەمانکاتدا موسڵمانانیش حوکمی ناسخەکان جێبەجێ دەکەن.

ئیتر بۆچی دەتەوێت ڕاستییەکان به قسەی چنراو بشاریتەوە؟! ئەگەر تۆ بۆ خۆت باسەکەیت نەبیستووه هۆی دیراسه نەکردنی خۆته بۆ ئیسلام، تاوانی ئیسلام‌و موسڵمانان چییه؟!

٢٩. له لاپەڕه (٩٩) تا لاپەڕه (١٥٣) باس لەو سوورەتانه دەکات که به قسەی خۆی ناسخ یان مەنسوخ، یان هەردووکیانی تێدایه، لەو پەنجاو چوار لاپەڕەیدا تاریکستانێکی دروستکردووه ئەگەر به ئارەزووی ئەوبێت کاتێك بەئاگا دێینەوه قورئان هیچی نەماوه، بەڵام خوێنەری بەڕێز هەر بەشێوەی دەست پێکردنی (زەردەشتی) ئێمەش دەستپێدەکەین‌و چەند نموونەیەکی لێ چارەسەر دەکەین‌و مشتێکیش لەو نموونانه نموونەی خەروارەکەی (زەردەشتی)یەو خوێنەر دەتوانێت لەوێوه بزانێت (زەردەشتی) بۆ ئەوانەی نووسیوه.

١. دەڵێت: "(..وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُون) بەحوکمی ئایەتی زەکات له کارکەوتووه".

ئەم ئایەته جگه لەوەی که باسی ڕەوشتەکان (ڕەوشتی بەخشین)، وەك لەپێشەوه باسمانکرد هیچ کام له ڕەوشتەکان نەسخ نابن‌و پێناسەی ڕەوشت نایگرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەمان پەڕاو که له زۆرێك له نووسینەکانتدا بۆ چەواشەکردن دەڵێیت لەسەرچاوەی (الاتقان في العلوم القران)وەرمان گرتووه".

بۆ بەرچاو ڕۆشنی خوێنەر دەربارەی ئەم ئایەته، ئەو سەرچاوەیه دەڵێت: "والذي أقوله: ان الذی وردة المنكرون أقسام: قسم ليس من النسخ في شئ ولا من التخصيص ولا له بها علاقة بوجه من الوجوه و ذلك مثل قوله تعالى (وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُون..)، (وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم..) و نحو ذلك قالو انه منسوخ باية الزكاة، وليس كذلك، بل هو باق"[1].

(سیوطي) که خاوەن کتێبەکەیه دەڵێت: "ئەوەی که زۆر بلێکان نووسیویانه چەند جۆرێکه: جۆرێکیان هیچ پەیوەندییەکی بەنەسخەوه نییەو (تخصیص)یش نییه بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان" وەك ئایەتی (وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُون)، (وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم) وێنەی ئەو ئایەتانه که وتوویانه نەسخ بەئایەتی زەکات، که ئەو قسەیه ڕاست نییه، بەڵکو نەسخ نەبووەو حوکمەی ماوەتەوه".

٢. زەردەشتی دەڵێت: "(اِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ..) لەکار کەوتووه، ئەم ئایەته هاتۆته شوێنی (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينا)".

ئەم ئایەتەش نەسخ نەبووه، بەڵکو له ئایەتی یەکەمدا باس لەو ئاینانه دەکات پێش موحەممەد، پەیامبەر ﷺ هاتووەو ئیماندارانی ئەو ئایینانه لای خوای گەوره پاداشتیان هەیەو ترس‌و دڵگرانی ڕوویان تێناکات، بەڵام بەهاتنی "ئیسلام" پێویسته هەموو خواناسان جگه لەئیسلام نەکەنه دینی خۆیان، ئەگەر هەر کەسێك جگه له ئیسلام وەرگرێت ئەوا لەدنیادا زۆری لێناکرێت، چونکه (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين..)، بەڵام بۆ قیامەت خوالێی وەرناگرێت.

دین‌و مرۆڤو قیامەت خوا خاوەنیەتی‌و بەویستی خۆی دەکات، هەر کەس حەز دەکات بانەمرێت‌و زیندووش نەبێتەوه.

٣. دەڵێت: "(..وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً..) قسەی باش بەخەڵکی بڵێن، حوکمی ئەم ئایەته لەکار کەوتووه (مەنسوخه)و لەبری ئەم ئایەته هاتۆته شوێنی (فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (التوبة: ٥)[2]".

---

[1] لاپەڕه (٢٩) الاتقان في علوم القران ج٢ بيروت ـ لبنان.

[2] لاپەڕه (٩٩)ی (خوێننامه).

زمانپاکی و زمان شیرینی لەڕەوشتە سەرەکییەکانی ئیماندارانەو کاتێك نییە لەژیانیاندا وازی لێبهێنن، نەك هەر بەم ئایەتە پیرۆزە، بەڵکو بەچەندەها ئایەت و فەرموودەی شیرینی پەیامبەریش ئەو داوایە دوپات دەکەنەوە وەك (وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ..) یان (ليس المؤمن باللعان والطعان ولا بذئ) تەنانەت لەکاتی شەڕیشدا جنێوفرۆش و زمان پیس نەبوون.

ئەگەر شتێکیش بووبێت ئەوا شەڕیان شەڕبووەو ئاشتییان ئاشتی، مەگەر کورد شانازی ناکات بەهەڵوێستەکانی خۆیەوە لەو دوو دۆخەدا.

٤. دەڵێت: "(..فَاعْفُواْ وَاصْفَحُوا..) لێیان ببوورن و بیانبەخشن.. حوکمی ئەم ئایەتە لەکار کەوتووە (مەنسوخ) لەبری ئەم ئایەتە هاتۆتە شوێن (قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ) (التوبة: ٢٩)".

ئەمەش بێگومان نەسخ نەبووەو لێبوردن و بەخشین ڕەوشتی بنەڕەتین و لێبووردەیی نیشانەی ئیمانی ئیماندارانەو بەخشین پێوەرە بۆ ڕاستیی ئەو ئیمانە. ئەم نموونەش وەك نموونەکەی پێشوو وایەو یاسای نەسخ نایگرێتەوە.

٥. دەڵێت: (..فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ..) مەنسوخە بەئایەتی (..وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ..).

ئەمەش هەر پێی ناوترێت نەسخ، بەڵکو ئایەتی یەکەمیان هەواڵ ئەدات کە خوای گەورە خاوەنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەو هەموولایەك لە موڵکی ئەو بەدەرنییە.

لەگۆڕینی قبلە لە "بيت المقدس"ەوە بۆ "کەعبە" جیاوازی نییە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە ئاستی پابەندبوونی و گوێڕایەڵی خواناسان تاقی دەکاتەوە، یان کاتێك گەشتیار لە پاپۆڕو ئۆتۆمبێل و فڕۆکەدا نوێژ دەکات لەو کاتەدا واجب نییە لەسەری کە تەنها ڕووی لە کەعبەی بێت. ئایەتی (مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ) باسی گۆڕینی قیبلە دەکات بۆ کەعبەو داوا دەکات لە حاڵەتە ئاساییەکاندا موسڵمانان بۆ نوێژکردن ڕووبکەنە کەعبە. ئەگەر ئەمە نەقڵ بێت بۆ لەسەرچاوە موعتەبەرەکانەوە نەقڵی ناکەیت؟

٦. دەڵێت: (..لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُم..) حوکمی ئەم ئایەتە لەکارکەوتووە لەبری حوکمی ئەم ئایەتە هاتۆتە شوێنی: (فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (التوبة: ٥). (خوێننامە لاپەڕە (١٠١).

ئایەتی یەکەم کە (زەردەشتی) حوکمی نەسخی بەسەردا دەدات: (..لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُم..) پارچەیەکەو درێژەی ئایەتەکە دەرفەموێت: (قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي اللّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ) (البقرة: ١٣٩). ئەم ئایەتە پیرۆزەش بەدوای کۆمەڵێك ئایەتی تردا دێت کە باس لەموناقەشەی نێوان موسڵمانەکان و (ئەهلی کتاب) دەکات، ئەهلی کیتاب (جولەکەو گاور) دەیانوت ئیبراهیم پەیامبەر لەسەر دینی ئێمە بووەو لەنێوان خۆیشیاندا هەمان کێشەیان هەبووە، بەڵام خوای گەورە ڕوونیکردەوە کە کاتی بوونی ئیبراهیم زۆر پێش موسا بە پەیامبەرو عیسا پەیامبەر هاتووە، پاش باسی درێژەی موناقەشەکەو دەرخستنی ڕووی حەقیقەت، خوای گەورە دەفەرموێت: "ئەی موحەممەد بە ئەهلی کیتاب بڵێ ئایا ئێوە موجادەلەی ئێمە دەکەن لەئایینی خوادا کە خوای ئێمەو ئێوەشە، کاری ئێمە بۆ ئێمەو ئێوەو کاری ئێوەش بۆ خۆتان، ئێمە موخلیسی خواین".

ئایەتی دووهەمیش باس لە موشریکەکانی مەککەو دەوروبەری دەکات کە دیسان لە نموونەیەکی تریشدا بەناسخت داناوە، کەواتە وەك دەرکەوت نابن بە مەنسوخ و ناسخ، بەڵکو هەریەکەیان وەك خۆی دەمێنێتەوە.

بۆ کاکی (زەردەشتی) ڕستەیەك لەئایەتێك جیادەکاتەوە کە ئەو کۆمەڵە ئایەتە بەیەکەوە باسی لەیەك شێوازی موناقەشەکردن دەکەن؟

خۆ هەرچەندە ئەو پارچە لەو ئایەتەش حەقیقەتێکی چەسپاوە، چونکە هەرکەسێك هەڵگری کردەوەی خۆیەتی و پرسیاری کردەوەی کەسانی تری لێناکرێت.

لەکۆتایی هەمان بەشدا خوا دەفەرموێت: (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (البقرة: ١٣٤). واتە: ئەوانەش پێش ئێوە ئومەتێك بوون، ئەوەی کردوویانە بۆ خۆیانەو بۆ ئێوەش ئەوە هەیە کە دەیکەن، پرسیاری کردەوەی ئێوە لەئەوان ناکرێت.

٧. (..فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا..) (البقرة: ١٥٨) (زەردەشتی) دەڵێت: ئەمە مەنسوخە بەئایەتی (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِالله ..) تەواوی ئایەتەکە کە ئایەتی (١٥٨)ی سورەتی (البقرة)یە ئەم شێوەیە: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْراً فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ١٥٨). واتە: بەڕاستی صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوانو هەرکەسێك حەجی ماڵی خوای کرد یان عەمرەی کرد تاوان نییە ئەگەر تەوافیان بکات.

خوێنەری بەڕێز، لەسەردەمی نەفامیدا کە خەڵکی حەجیان دەکرد تەوافی نێوان سەفاو مەروەیان دەکرد، کاتێکیش ڕێوڕەسمی حەجی موسڵمانەکان دەکرا هەر سەفاو مەڕوەکەی تێدابوو. موسڵمانانیش ڕاهاتبوون تەواوی بەرگی نەفامی لاببەن بۆیە لەکاتی سەفاو مەروە کردندا کەمێك پارێزیان دەکرد، بەڵام خوای گەورە بۆی دووپات کردنەوە کە تاوان نییەو لە دروشمەکانی خوان. ئیتر کەی ئەوە (نەسخ)ەو لەو کاتەدا کە دەفەرموێت دروشمی خواییێ هەمان شتە کە دەفەرموێت تاوان نییە.

جێگەی شانازی ئێمەی ئافرەتانی موسڵمانە کە هەموو حاجییەکی ماڵی خوا بەژنو پیاوەوە شوێن هەنگاوەکانی "هاجرە" خاتوون هەڵدەگرنو سەفاو مەروە دەکەنو بۆتە دروشمێکی خوایی.. کوان ئەوانەی هاواری مافخوراویی ئافرەتان بەرز دەکەنەوەو چەندەها بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئافرەتان دروست دەکەن؟ بابێن سەیری پلەی ئافرەت بکەن لە ئیسلامداو بزانن چۆن ڕێزێکمان لێگیراوە[1].

٨. (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ) (البقرة: ١٥٩). زەردەشت دەڵێت مەنسوخە بە (إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَـئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) (البقرة: ١٦٠).

ئەم ئایەتەش هەر نەسخ نەبووەتەوە، بۆ هەموو خەڵکییەو لە هەموو زەمانێکدا تاقیامەت، هەرکەسێك ئاشنابێت بە حەقیقەتەکانو بەئەنقەست بیشارێتەوە لەبری ئەوەی بەخەڵکی بڵێت ئەوا نەفرەتی خواو نەفرەتکارانی لێیە، ئەم نەفرەتەش بەردەوام بەدوایەوە دەبێت مەگەر پەشیمان ببنەوەو پەشیمان بوونەکەیشیان بۆ خەڵکی ڕوون دەکەنەوە (إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ..).

بۆنموونە نووسەری "خوێننامە" چەندەها سەرچاوەی خوێندۆتەوەو گەڕاوە بەناویاندا لەڕاستییەکان چاوپۆشی کردووەو کامە مایەی گومان دروستکردنو شاردنەوەی حەقە نووسیویەتیو بەمەرامی تایبەت خیانەتی لە نەقڵدا کردووە.

ئەوا ئەو ئایەتە تۆش دەگرێتەوە، کاتێك لە نەفرەتی خوا ڕزگارت دەبێت کە لەنێوانی خۆتو خوا پەشیمان ببێتەوەو لای خەڵکیش ڕوونی بکەیتەوە کە تۆ پەشیمانیت، ئەمەش گران نییەو بە فەزڵ ئەژمێرڕێتو سیفەتی پیاوە ئازاکانە، ئەگەرنا هەموو کەس ئازادەو لە دونیادا چۆن دەڵێتو بڕوای چۆنە بابە ئارەزووی خۆی بێت، "(..فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُر..) واتە: هەرکەس ئارەزوو دەکات با ئیمان بهێنێتو هەرکەسێك ئارەزوو دەکات بابێبڕوا بێت".

خوێنەری بەڕێز: لەکۆتایی ئەم باسەدا دەیڵێمەوە وەك ڕوونیشمان کردەوە، هەموو ئایەتە مەنسوخەکان چەند ئایەتێکی کەمی دیاریکراونو لەپێشەوەیش حیکمەتی ئەوەمان باسکرد، ئەوەی (زەردەشتی) زۆرترینی بەشی کتێبەکەی بۆ تەرخان کردووە لە چەند دێڕێکدا دەنووسرێت.

---

[1] ئەمە تەنها نموونەیەکەو چەندەها نموونەی لەو شێوە لەئیسلامدا هەیە کە هیچ دەستوورو یاسایەکی تر ناتوانن وێنەی بهێنن.

٣٠. (زەردەشتی) لە لاپەڕە (١٥٣)دا لە باسی ڕەش و سپی لە دەقی پیرۆزدا ئەوانەی پێشووی ئەم بابەتە دەکاتە بناغە بۆ داڕشتنی چەند قسەیەکی نابەجێی ترو دەڵێت: "لەکار خستنی زیاتر لە دووسەد ئایەت لە قورئاندا کە ڕۆژانە ملیۆنەها کەس دەیخوێنێتەوەو حوکمی لێوەردەگرێت مانای چی؟ خوا بۆ ئەوەندە حەزی لە ئینسان کوشتنە؟؟!! یان ئەمەیە هیواو هەوەس و ئامانجی پەیامبەرێکە کە بڕوای بەهیچ پەروەردەیەکی کۆمەڵایەتی و عادیلانە نەبێت!!.

١. ئەگەر گرفتی (زەردەشتی) بەوە چارەسەر دەکرێت کە ئەو دووسەد ئایەتە نەسخ نەبووبن، ئەوا ئێمە بە بەڵگەوە سەلماندمان کە نەسخ نەبوون و ئەو تەعالیمە جوان و ئاوازانەی کە (زەردەستی) شایەتی چاکی بۆ داون وەك خۆیان ماون و هەرکەسیش بڵێت نەسخ بوون بەهەڵەدا چوون.

٢. خوێندنەوەی ئەو ئایاتانە لەلایەن ملیۆنەها کەسەوەو حوکم لێوەرگرتنی بەڵگەیەکی ترە لەسەر نەسخ نەبوونی، چونکە ملیۆنەها موسڵمانی شارەزا بەزانستە شەرعییەکان زۆر دوورە بەهەڵەدا بچن و کەسێکی وە (زەردەشتی) عەرەبی نەزان و نەشارەزا بەزانستە شەرعییەکان ڕاست بکات.

٣. پرسیاری "خوا بۆ ئەوەندە حەزی لەئینسان کوشتنە؟". زۆرنابەجێیە، چونکە حەزی بە ئینسان کوشتن نییەو (مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعا) (المائدة: ٣٢). ئینسانی بۆیە دروست کردووە تازەوی پێ ئاوەدان بکاتەوە، نازانم (زەردەشتی) بیری لەوە نەکردۆتەوە ئەگەر خوا بیەوێت هەموو مرۆڤایەتی بەیەکجاو لەناو ببات کێ هەیە بەرگری بکات و نەهێڵێت؟ ئایا زەردەشتی بیری لە "بەزەیی و لێبووردەیی" خوا نەکردۆتەوە کە ئەم وەك مرۆڤێکی بێ دەسەلاتی کەم توانا شەڕی لەگەڵ دەکات و قورئان و پەیامبەرەکەی بەدرۆ دەزانێت کەچی هێشتا خوا مۆڵەتی داوەو دەخوات و دەخواتەوەو هەوای خوا هەڵدەمژێ و خۆشیی لەژیان دەچێژێ و..

ئایا نازانێت ئەوە هەموو ڕەحمی خوایە؟! ئایا نازانێت نەخۆشی هەیە نەپارەو نە پزیشك و نەخۆشەویست و دڵسۆزەکان ناتوانن لەئازارەکەی کەمکەنەوەو نەیهێڵن؟

ئایا نازانێ دڵ کەوەستا ئیتر ژیانیش دەوەستێت؟ کەچی خوا هێشتا فەرمانی بەوەستان نیەکردووە.. دیارە خوا حەزی بەگەڕانەوەی بەندەکانێتی و فرسەتیشیان ئەدات. خوا حەز دەکات لەژیانی نەبڕاوەدا خۆشی زۆرو نەبڕاوە ببەخشێت.. خوا مرۆڤ فێر دەکات لەهەردوو ژیانەکەدا داوای خۆشگوزەرانی بکات و هەر کەسێك بەڕاستی داوای بکات بێگومان پێی دەبەخشێت. (وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ*أُولَـئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ وَاللّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ)[1].

٤. هیواو هەوەس و ئامانجی پەیامبەر ﷺ ئەو هیواو هەوەس و ئامانجانە بووە کە خوا بۆی دیاری کردووەو لەوەحی خوا لاینەداوە، ئەگەر لایبدایە هەڕەشەی خوایی بەسەردا جێبەجێ دەکرا، کە خوا فەرموویەتی: (وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ* لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ* ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ* فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ* وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ* وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ* وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ* وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ* فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ)[2].

خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر (موحەممەد) بەدەمی ئێمەوە قسە بکات، (هەروەك چۆن دوژمنەکانی ئیدیعای ئەوە دەکەن زیاد بڵێت یان کەم بڵێت)، ئەوا بە پەلە تۆڵەی لێدەکەینەوە، بەڕاستمان دەیگرین و بەنی دڵی دەبڕین، ئەو کاتە کەستان نییە ڕێگریمان بکات، ئەم قورئانە یادەوەرییە بۆ پارێزکاران، لەگەڵ ئەمانەشدا ئێمە دەزانین لەناو ئێوەدا هەیە ئەم قورئانە بەدرۆ دەخاتەوەو بوونی ئەم قورئانەو باوەڕهێنان پێی داخە لە دڵی بێ باوەڕاندا، بەڕاستی ئەم قورئانە هەقێکی

---

[1] ٢٠٠ ـ ٢٠٢ البقرة.

[2] ئایەتەکانی (٤٤ ـ ٥٢) الحاقة.

حاشاهەڵنەگرە[١]و گومانی تێدا نییە، کەواتە تەسبیحاتی پەروەردگارت بکە کە زۆر گەورەیە، واتە ئەو خالق‌و پەروەردگارەی ئەم قورئانە گەورەیەی دابەزاندووە[٢].

٥. "ڕەش‌و سپی" لەقورئاندا هەر نییە بەتایبەت بەو شێوەیەی کە (زەردەشتی) نموونەی بۆ دەهێنێتەوە، بۆ نموونە دەڵێت: "لەلایەك خوا دەڵێت: هیچ ڕق‌و کینەیەك لەئاییندا نییە، لەلایەکی ترەوە دەڵێت: نەخێر ڕق‌و کینە هەیە‌و بیانکوژن"[٣].

نازانم ئەمە لەکوێی قورئاندا هەیە؟ بۆ بەئایەت نەینووسیوە؟ ئەگەر وا دەزانێت (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين..) واتای ئەوەیە کە هیچ ڕق‌و کینە لەئاییندا نییە، ئەوە وانییەو (إِكْرَاهَ) واتە (زۆرکردن) لەکەس نییە بۆ موسڵمانکردنی.

هەموو نموونەکان هەر بەو شێوەیەن، هیچیان ڕاست نین، چونکە بەئارەزووی خۆی نووسیویەتی‌و ئیسلام لەوانە بەرییە.

[١] حەقێکی حاشا هەڵنەگر "علم اليقين" کۆتا پلەی زانستە، واتە ئەم قورئانە پلەکانی (شك)و (ظن)و (غلبة الظن)و (علمی)و تێپەڕ کردووەو لەکۆتا پلەی زانستیدایەو گومان لەوە ناکرێت کە خوا ناردوویەتی‌و موحەممەدیش تەنها گەیەنەرە بۆی.

[٢] تەفسیری "مختصر تفسير ابن كثير" ج٣ ص ٥٤٦.

[٣] لاپەڕە (١٥٤)ی خوێننامە بابەتی ڕەش‌و سپی لە دەقی پیرۆزدا، لەژێر ناونیشانی بانێکەو دوو هەوا.

٣١. (خوێننامە) لەلاپەڕە (١٦٠)دا دەڵێت: "قەدەغەکردنی نووسینەوەی فەرموودەکان لەکاتی خۆیدا لەلایەن چوار خەلیفەکەو بەردەوامبوونی ئەم قەدەغەکردنەیە لەلایەن مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان‌و خەلیفەکانی دیکە، تا دەگاتە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە ئەو ڕێچکەیەی شکاند..".

(زەردەشتی) لەچەند دێڕێکدا کە هەمووی چنراوی خۆیەتی‌و پشت بەهیچ سەرچاوەیەك نابەستێت جگە لەمەش دوو هەڵەی زۆر دیارو شاخدار دەکات.. لەلایەك دەڵێت: "چوار خەلیفەکە نووسینەوەی فەرموودەیان قەدەغە کردووەو چوار خەلیفەکەش (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی)یە خوایان لیٚ ڕازی بێت".

لەلایەکی ترو یەك دوو دێڕ دوای ئەوە دەڵێت: "عەلی کوڕی ئەبو تالب یەکێك بووە لەوانەی سەرپێچی خەلیفەی دووەمی کردووەو فەرموودەی نووسیوەتەوە". ئاخر ئەمە چەندی بەچەندە؟! پاشان دەڵێت: "ئەوانەی فەرموودەیان نووسیوەتەوە لەسەردەمی (عومەر)دا (فاطمة بنت الرسول) بووە".

کە بەشایەتی مێژوونووسان‌و لەسەحیحی بوخاریشدا هاتووە کە فاتیمەی کچی پەیامبەر (خوای لێڕازی بێت) شەش مانگ دوای پەیامبەر کۆچی دوایی دەکات. ئیتر چۆن پاش مردنی بەچەند ساڵێك فەرموودە دەنووسێتەوە.

٣٢. لەلاپەڕە (١٦٢)دا (خوێننامە) فەرموودەیەك دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "عائیشە خێزانی پەیامبەرو کچی ئەبوبەکر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (باوکم فەرموودەی زۆری پەیامبەری کۆکردەوە نزیکەی (٥٠٠) فەرموودە دەبوون، لای من هەڵیگرتبوون، شەوانە ئەمدیوو ئەودیووی پیٚ دەکردن، ڕۆژێك بەمۆنییەوە تەماشای کردم، منیش پێم گوت دەتەویٚ چی بڵێی؟ یاخود شتێکت بیستووە دەتەویٚ پێم بڵێیی؟ کەمێك هاتە سەرخۆی‌و وتی: کچەکەم ئەو فەرموودانەی لای تۆن بۆم بهێنە، منیش بۆم هێنان‌و ئەویش ئاگری تێبەردان، پێم گوت بۆچی سووتاندتن؟ وتی: ترسام لەوەی بمرم ئەم فەرموودانە لەلام بمێننەوەو فەرموودەی پیاوێکی تێدا بێت کە متمانەم پێکردووەو متمانەی پێکردووم، دوایش بەوشێوەیە نەبێت کە من نووسیومەتەوە)".

لەپەراوێزدا ئاماژە بەوە دەکات کە لە "تذكرة الحفاظ"ی زەهەبی وەریگرتووە کەچی لەڕاستیدا ئیمامی زەهەبی باسی لەوە کردووە کە ئەوە ڕاست نییەو فەرموودەی سەحیح نییەو خاوەنی "السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي"[1]یش دەڵێت ڕایەکەی زەهەبی دەربارەی ئەو فەرموودەیە ڕاستە، بۆچی ئەو خیانەتە گەورەیە دەکەیت، کە دەزانیت زەهەبی ڕای چۆنە بۆ فەرموودەکە بۆ نەقڵی دەکەیت‌و خوێنەر واتێدەگەیەنێت پێشەوا لە "جرح والتعديل"دا لەو فەرموودە ڕازییە؟!

پاشان ئەو پرسیارو ئیحتیمالاتانەی لەسەر ئەو فەرموودەیە دروستی دەکەیت هەمووی بەتاڵە، چونکە بناغەی باسەکەت ڕاست دەرنەچوو. پاشان فەرموودەی: "هەرکەسێك شتی لەسەر من نووسیوە بابیسڕێتەوە". (زەردەشتی) خۆی لێدەکاتە "مجتهد"و دەڵێت: "ڕاست نییە؟".

بەچ حەق‌و بە چ پێوەرێك ئەم حوکمەی داوە؟! وا دەزانێت حوکمی ڕاستی‌و ناڕاستی فەرموودە هەروا هەڕەمەکییە. ئاخر چۆن وا دەبێت؟!

نەخێر حوکمەکەی زۆر هەڵەیەو ئەو فەرموودەیە سەحیحەو موسلم لە ئەبی سەعیدی خودری-یەوە ڕیوایەتی کردووە.

پەیامبەر ﷺ نەهی لەنووسینەوەی فەرموودە کردووە بەشێوەیەکی ڕەسمیی‌و بۆ ماوەیەك، چونکە نووسینەی (سنە)ش هاوکات لەگەڵ نووسینەوەی قورئان بۆ ئەوکاتەی دەوڵەتی ئیسلامیی کارێکی زۆر گران بوو لەبەر کەمی پێداویستی نووسین لەلایەك‌و زۆری سوونەتی پەیامبەریش ﷺ لەلایەکی تر، جگە لەمانەش حیکمەتی ئەو نەهییە بۆ نووسەرە ڕەسمییەکان بووە ئەمانیش وەك کەسانی تر سوننە تێکەڵ نەکەن بە قورئان‌و گرنگترین سەرچاوە تەواو بێت‌و پاشان دەستبدەنە گرنگ.

[1] السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي، لاپەڕە ١٥٩ ـ د. مصطفى السباعي.

ئەمانە هەمووی‌و بوونی هاوەڵان خۆیان وەك هەڵگری سوننە کرداری ئەگەر نووسینەوەی دواش بخرێت زەرەو نادات، چونکە وەك مەحوی وەسفی هاوەڵان دەکات‌و دەڵێت:

بەنووری عەکسی پێغەمبەر ئەمەندە مونعەکس بووبوون

غەریبی تازە هاتوو ئەیووت ئەم پێغەمبەرستانە

خوێنەری بەڕێز: وەك ڕوون بوویەوە نەهی پەیامبەر ﷺ بۆ نووسینی فەرموودە بەشێوە ڕەسمییەکەی بوو بەڵام چەند هاوەڵێکی پەیامبەر ﷺ بۆ خۆیانیان نەدەنووسییەوە، نموونەی ئەمەش وەك پەڕاوەکەی "عبدالله بن عمر بن عاص" کە ناوی لێنابوو "الصادقة".

ئیمامی ئەحمەدو بەیهەقی لەئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە ئەبو هورەیرە وتوویەتی: "کەس لەمن زیاتر فەرموودەکانی پێغەمبەری نەزانیوە، جگە لە "عەبدوڵڵای کوڕی عومەر" نەبێت، چونکە ئەو ئەینووسی‌و من نەم ئەنووسییەوە".

٣٣. (خوێننامە) لە لاپەڕە (١٦٢ . ١٦٦) ئەبوبەکری سدیق‌و عومەری کوڕی خەتتاب بە دوو هۆکار دادەنێت بۆ نەنووسینەوەی فەرموودە. بەڵگەکانی (خوێننامە)ش بەڵگەیەکی ناڕاستەو بەشایەتی ئیمامی زەهەبی بۆ خەلیفە ئەبوبەکری صدیق‌و بەڵگەیەکی مەقەست لێدراوەو بەهەڵە وەرگێراوە بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب.

ئەوەی کردوویەتییە بەڵگە بۆ خەلیفە ئەبوبەکر لەپێشەوە باسمان کردو ماوەتەوە ئەو بەڵگەیەی دەربارەی عومەری کوڕی خەتتاب هێناویەتەوە، دەڵێت: "تەنانەت جاری واش هەبووە حەزی نەکردووە گوێی لەفەرموودەکانی پەیامبەر بێت‌و جارێکیان وەفدێك دەنێرێتە کوفەو هەتا کەناری شاری مەدینە لەگەڵیان دەڕوات لەڕێگە پێیان دەڵێت:

. ئایا دەزانن بۆچی لەگەڵتان هاتووم؟

. بەڵێ لەبەر.. (تەواوی ناکات).

. بەڵکو لەبەر ئەوە هاتووم کە دەمەوێت ئەوەتان پێ بڵێم ئەگەر من بەهاوەڵ‌و شەریك دەزانن ئەوەندە باسی فەرموودەی پەیامبەر مەکەن[1].

خوێنەری بەڕێز من ئەسڵی فەرموودەکە نقڵ دەکەم‌و دەیکەمە کوردی، پاشان خۆت سەیری جێگە مەقەستەکانی (زەردەشتی) بکەو بزانە جگە لە نەزانینی ئەدەبی تەرجەمە، چەند بەمەرامی تایبەت هەڵەی کردووە.

روى الشعبي عن قرظة بن كعب قال: خرجنا نريد العراق فمشى معنا عمر الى صرار، فتوضأ فغسل آثنتين، ثم قال: أتدرون لم مشيت معكم؟ قالو نعم، نحن أصحاب الرسول الله مشيت معنا. فقال انكم تأتون أهل قرية لهم دوي، بالقران كدوى النحل فلا تصدوهم بالحديث فتشغلوهم.

جودوا القران واقلوا الرواية عن رسول الله ﷺ وأمضوا وأنا شريككم، فلما قد قرطنة قالوا حدثنا، قال: نهانا عمر بن الخطاب[2].

شەعبیی دەگێڕێتەوە لە (قرظه)ی کوڕی کەعبەوە دەڵێت: "دەرچووین بەنیازی ئەوەی بچین بۆ عێراق (عومەری کوڕی خەتتاب) بەپیادەیی لەگەڵمان هات تا گەیشتینە (صرار)[3] لەوێ دەستنوێژی گرت‌و دوو جار دووجار ئەندامەکانی دەستنوێژی شۆردو پاشان فەرمووی: ئایا دەزانن بۆچی لەگەڵتان هاتم؟ وتیان بەڵێ، ئێمە لە هاوڵەکانی پەیامبەرین هاتوویت لەگەڵماندا. فەرمووی: ئێوەدەڕۆن لای خەڵکی شوێنێك ورە وریان بەقورئان وەك ورەی هەنگە، ئەو حاڵەتەیان تێکمەدەن بەفەرموودە خەریکیان بکەن، قورئان بەتەجویدەوە بخوێنن‌و کەمتر لە پەیامبەر ﷺ بگێڕنەوە، ئیتر بڕۆن‌و من شەریکتانم".

کاتێك (قرظه) هات وتیان فەرموودەمان بۆ بگێڕەرەوە، وتی: عومەر ڕێگری لێکردین.

---

[1] (خوێننامە)، لاپەڕە ١٧٦ ـ چاپی ٢٠٠٢.

[2] جامع البیان لعلم ١٢/٢.

[3] ناوی شوێنێکە نزیك مەدینە.

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا وەردەگیرێت:

١. ئیمامی عومەر، ڕەزای خوای لێبێت، زانایانی فەرموودەی زیندانی نەکردووە بەپێچەوانەوی ئەوەی (خوێننامە) ئیددیعای دەکات. لەشوێنی خۆیدا کەمێکی تر ئەمە ڕووت دەکەینەوە.

٢. عومەر خوای لێڕازیبێت ڕێزی زانایانی گرتووەو بۆ خواحافیزی لەو زانایانە بە پیادە لە گەڵیان ڕۆشتووەو ئەوەندە ئەم حاڵەتەی چەندبارەی کردۆتەوە لای هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ بەئاشکرا دیاربووە، بۆیە لەوەڵامدا دەڵێت: "ئێمە لە هاوەڵانی پەیامبەرین بۆیە بەڕێزەو بەڕێمان دەکەیت".

٣. ئیمامی عومەر ڕەزای خوای لێبێت، نەهی لێکردن کە بۆ ئەو کۆمەڵە خەڵکە فەرمووده بگێڕنەوە، چونکە خەریکی قورئانن بۆ ئەوەی کارەکەیان بەتەواوی بەئەنجام بگەیەنن و تایبەتمەندی تێدا بکەن و خەریك نەبن بەکارێکەوە کە بەپلەی دووەم دێت.

کەواتە ڕوون بووەتەوە ئەبوبەکری سدیق و عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوایان لێبێت) هۆ نەبوون بۆ نەنووسینەوەی سوننەت، بەڵکو ئەو دوو زاتە بەڕێزە دوو وەزیری خۆشەویستی پەیامبەر ﷺ بوون و لەسەرەتای گزنگی ئیسلامەتییەوە تا تەواوبوون و کامڵبوونی خۆری ئیسلامەتی ئەو دوو بەڕێزە پێشبڕکێی یەکتریان دەکرد لەسەر خێرو چاکەو بەماڵ و منداڵ و نەفس لەپێناوی خواو پەیامبەردا ﷺ تێدەکۆشان و تەمەنیان پێشکەشی خوا کرد.

فەرموودەیەکی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەیە دەربارەی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق لەو فەرموودەوە خوێنەر گەورەیی ئەبووبەکری بۆ دەردەکەوێت و بۆی ڕوون دەبێتەوە چەندە ئەوزاتە گیان فیدای پەیامبەر ﷺ بووە، لەسەرەتای بانگەوازی پێغەنمبەرەوە تا کاتی دەوڵەتیش.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب وتاری بۆ خەڵکی ئەدا، فەرمووی: "ئەی خەڵکینە کێ ئازاترینی خەڵکە؟ وتیان: تۆ ئەی گەورەی ئیمانداران، فەرمووی من کەس نەبووە بەرەنگارم بووبێتەوە لەشەڕداو سەرنەکەوتبم بەسەریدا، بەڵام ئازاترینی خەڵك ئەبوبەکرە، ئێمە لەشەڕێکدا کەپرێکمان بۆ پێغەمبەر ﷺ دروستکردو وتمان کێ لەگەڵ پەیامبەر ﷺ دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کەس پەلاماری نەدات؟ سوێند بەخوا کەس نەچووە پێشەوە ئەبوبەکر نەبێت، شمشێرەکەی دەرهێناو لەسەر سەری پێغەمبەر ﷺ وەستاو هەکەسێك پەلاماری بدایە ئەویش بەرگری لێدەکردو پەلاماری هێرشەکەی دەدایەوە، ئەوەیە ئازاترینی خەڵك"، دیسان ئیمامی عەلی فەرمووی: "من پێغەمبەرم ﷺ بینی قورەیشییەکان ئازاریان دەدا، هەریەك بەشێوەیەك بە پێغەمبەریان ﷺ دەووت: ئەوە تۆی هەموو خواکان دەکەیت بەیەك خوا؟ لەو ڕۆژەدا بەخوا قەسەم کەس لێی نزیك نەکەوتەوە ئەبوبەکر نەبێت، تێدەکۆشاو لەهێرشکارانی دەداو ئەیفەرموو: داماوی بۆ ئێوە، ئازاری پیاوێك دەدەن کە دەڵێت: الله پەروەردگارمە"، پاشان ئیمامی عەلی ئەوەندە گریا تا ڕیشی پیرۆزی تەڕبوو پاشان فەرمووی: "سوێندتان دەدەم بەخوا، ئایا ئیماندارەکەی هۆزی فیرعەون باشتربوو یان ئەبوبەکر؟ خەڵکەکە بێدەنگ بوون، ئیمامی عەلی فەرمووی: سوێند بەخوا کەمێك لە ژیانی ئەبوبەکر باشترە لەوەی زەوی پڕبێت لەوێنەی ئیماندارەکەی ئالی فیرعەون، چونکە ئەبوبەکر ئیمانی هێنا، خۆی ڕاگەیاند، ئەو ئەیشاردەوە"[1].

جگە لەمەش ئایەتی (ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا). شەرەفێکی گەورەیە بۆ ئەبوبەکر کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە لەناسکترین کاتدا، فەرموویەتی بە ئەبوبەکر دڵگران مەبە خوا لەگەڵ ئێمەدایە، خوای گەورەش ئەو هەڵوێست و فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ بەئایەت نازڵ دەکات.

یەکەم کەسێك بووە نازناوی جێنشینی پێغەمبەری پێبەخشرێ و ئەو نازناوە لە کەسی تر نەدراوە، گەورەیی ئەبووبەکر ئەوەندە زۆرە پەڕاوی تایبەتی دەوێت و بەڵام بۆ عاقڵ ئیشارەت بەسە.

[1] البداية والنهاية ص ٢٧١، ج٣ ـ أبوبكر الصديق. ص ٣٥، د. على محمد صلابي.

دەربارەی فەرموودەش ئیمامی زەهەبی لەباسی ئەبوبەکری سدیقدا دەڵێت: "یەکەم کەسێك بووە کە حسابی زۆری کردووە بۆ وەرگرتنی فەرموودە"[١].

ئەوە ڕاستییەکانەو ئەوانەش دەڵێن ڕێگربووە مەگەر تەنها ئەوەی ڕاست بێت کەڕێگر بووە لەدرۆزنەکان، کە درۆ بەدەم پەیامبەرەوە دروست بکەن، ئیمامی عومەریش هەر بەشێوەی ئەبوبەکر بووە، ئەگەر ئوممەتی ئیسلامی لەسەر سیاسەتی (ئەبوبەکرو عومەر) بمانایەتەوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە ئەوا کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد درۆ بەدەم پەیامبەرەوە دروست بکات، چونکە بەرنامەی ئەو دوو خەلیفەیە بوونی دووشاهید یان زیاتر بوو بۆ وەرگرتنی فەرموودەو بەرنامەی ئیمامی عەلیش سوێنددانی ڕاوییەکە بوو، خوای گەورە لە هەرسێکیان ڕازی بێت.

٣٤. لەلاپەڕە (١٨٦)دا (خوێننامە) باس لەوە دەکات کە ئیمامی عومەر چەند هاوەڵێکی پەیامبەری ﷺ لای خۆی زیندانی کردووە، کەناوەکانیان (ئیبن و مەسعود، ئەبوو دەرداو، ئەبوو زەر)ن.

خوێننامە ناوی سێهەمیانی لەخۆوییەوە گۆڕیوە بە ئیبنو مەسعودی ئەنساری، کە لەڕاستیدا بە ئەبو زەڕی غەففاری بەناوبانگە.

ئەو گۆڕین و جۆە هەڵانە شتێکی سروشتییە لای خاوەنی (خوێننامە)، بەڵام ئەوەی پێویستە بیڵێین لێرەدا ئەوەیە بناغەی ئەم قسە چنراوەش هەر بۆ شەو لەپەڕاوی "الأحكام"دا ئیبن و خزم ئەم فەرموودە بە "منقطع" ناوزەد دەکات و بەیهەقیش ئەوەی ئیبن خزم بەڕاست دەگێڕێ[٢]، کاکە بۆ پەنا دەبەیت بۆ بەڵگەیەك کە بەئاشکرا دیارە ناحەزانی عومەر چنیویانەو واز لە چەندەها بەڵگەی ڕاست و دروست دەهێنیت کە زانایانی فەرموودە بەڕاستیان گێڕاوەو بەسەنەدی سەحیح بۆمان هاتووە.

یەکێك لەوانە:

ئیبنو مەسعود لەگەورە پیاوانی سەحابە بووەو لای ئیمامی عومەردا جێگەی تایبەتی خۆی هەبووە، تەنانەت کاتێك ناردی بۆ عێراق، خەڵکی عێراقی منەتبارکرد بەوەی پێی وتن: "بەڕاستی من فەزڵی ئێوەم داوە بەسەر خۆمدا بەناردنی عەبدوڵلا بۆتان". لەماوەی خیلافەتی عومەردا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لەعێراق بووە[٣].

پاشان ئەبوو دەرداو ئەبو زەر بەئەندازەی ئەبوهورەیرەو ئیبنو عەباس و عائیشەو جابری کوڕی عەبدوڵلا فەرموودەیان ڕیوایەت نەکردووە، ئەی بۆ ڕێگری لە هەموو ئەمانە نەکردووەو ڕێگری لەو دوانە کردووە؟!، تەنانەت کە ئەبو هورەیرە لەهەموو ئەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە زۆرترینی فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ڕۆژێك ئیمامی عومەر کە دەزانێت زۆر باسی فەرموودە دەکات پێی دەڵێت: "ئایا تۆ لەگەڵ ئێمە بوویت کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەفلانە شوێندا بوو؟"، ئەبو هورەیرە وتی: "بەڵێ، گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺفەرمووی: هەرکەسێك بە عەمدی قسە بەدەمی منەوە بکات باشوێنی خۆی لە ئاگردا دیاری بکات".

عومەری کوڕی خەتتاب پێی وت: کەواتە بڕۆ فەرموودە بۆ خەڵك باس بکە.

لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێت کە ئیمامی عومەر زانیارییەکی زۆری بەکات و شوێنی وتنی فەرموودەکانیش هەبووەو ڕێگری لەزانایانی فەرموودە نەگرتووە دوای تاقیکردنەوەیان هانیداون بۆ گێڕانەوەی.

لێرەدا حەقی خۆیەتی بپرسین ئەم ڕقە زۆرە بۆ لە خەلیفە ئەبوبەکری نازناوی (سدیق)و عومەری کوڕی خەتتابی نازناوبە (فارووق)؟

---

[١] السنة ومكانتها في التشريع الأسلامي. د. مصطفى السباعي.

[٢] السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي ـ د. مصطفى السباعي.

[٣] السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي ـ د. مصطفى السباعي.

٣٥. لەلاپەڕە (١٨٧ . ١٨٨)دا (خوێننامە) باس لە ئیمامی عوسمان دەكاتو دەڵێت: "هەمان ڕێڕەوی ئەبوبەكرو عومەری هەبووەو حەزی بەفەرمووده نەبووە".

خوێنەری بەڕێز لەوەڵامی دوو خەلیفەكەی پێشووەوە وەڵامی ئەمیش بزانە، شایانی باسیشە سەرچاوەی قسەكانی (زەردەشتی) لە پەڕاوێزدا دەڵێت لەدواوە باسی دەكەمو تاكۆتایش باسی ناكات. ئەم فێڵە چییە؟ بۆ گاڵتە بەعەقڵی خوێنەر دەكات؟

ئیمامی عوسمان خوای لێڕازی بێت، ئەگەر لە بەخشندەییو لێبووردەییو تێكۆشانو پلەو پایەی لەدڵی پەیامبەردا (كە دوو كچی خۆی یەك لەدوای یەكی پێداوە)، ئەمانە هەمووی باس نەكەینو تەنها باس لە ئەركی گەورەی نووسینەوەی قورئانو كۆپیكردنی بكەین بەسە بۆ ئەوەی ناحەزانی ئیسلام ڕقیان لێی بێت بوهتانی بۆ بكەن.

٣٦. لەلاپەڕە (١٨٩)دا باس لە ئیمامی عەلی-یش دەكات كە هەمان ڕێچكەی ئەبوبەكرو عومەری گرتووە.

ئێمەش دەڵێین بەڵێ ئەویش خوای لێڕازیبێت، هەمان ڕێچكەی ئەو سیانە بەڕێزەی پێش خۆی گرتووە، چونكە هەر چواریان پەروەردەكراوی دەستی پەیامبەر ﷺ بوونو هەمان هەستی بەرپرسیارێتییان هەبووە بەرانبەر پاراستنی سەرچاوەی دووهەمی ئیسلام كە سوونەتە.

(زەردەشتی) لەم باسەدا كە باسی فەرموودەیە باس لەوەش دەكات كە عەلی تووشی كێشەی سیاسیی زۆر بووەو لەگەڵ ئەوەشدا كە خەلیفە بووە نەیتوانیوە چارەسەریان بكات. زۆر هەڵەیەكی گەورەی كردووە كە دەیەوێت لەڕۆڵی ئیمامی عەلی كەم بكاتەوەو بەشیاوی خەلافەتی نەزانێ.

ئیمامی عەلی هاوكات لەگەڵ دەستبەكاربوونیدا گەلێك كێشەی زۆر گەورەی بۆ دروست بوو. هەر لەهەرای مافخوازانی خوێنی ئیمامی عوسمانەوەو جیابوونەوەی (خەوارج)و دروستبوونی كۆمەڵێك كە پیشەیان درۆ هەڵبەستن بوو لە كاروبارە گەورەكاندا، خۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی گەورەو فراوانی ئیسلامیش كارێكی ئاسان نەبوو.

ئیمامی عەلیش خوای لێڕازیبێت، تەمەنی خەلافەتی تەنها چوار ساڵ بوو، لەگەڵ ئەو تەمەنە كەمەشدا زۆرێك لە كێشەكانی چارەسەر كرد، زۆر بە حەكیمانە، ئەگەر دەستی خیانەتیش شەهیدیان نەكردایە دیارە كێشەكان بەو شێوەیان لێنەدەهات.

هەرچەندە دەوڵەتی ئیسلامیی بەویستی خوا هەموو كێشەكانی چارەسەركرد، خۆ ئێستە دەوڵەتی ئێمە پاش پانزە ساڵ لە حوكمڕانی كە باسی كێشەكانیان لادەكەیت بیانوو دێنێتەوە كە دەوڵەتەكەمان ساوایە، من ئەم قسە ناڵێم ڕاست نییە، بەڵكو تارادەیەك حەقە، بەڵام لێرەوە سەیرێكی بەویژدانانەی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە بكە لەگەڵ جیاوازی سنووری ئەم پارچە بچووكەی ئێستای ئێمەو ئەو دەوڵەتە بەرفراوانە پڕ لە زمانو ڕەگەزە لەگەڵ كەمیو لاوازی هۆكارەكانی گەیاندنیشدا.

ئەگەر بەراوردێك بكەین زۆر بە چاوی ڕێزو گەورەییەوە دەڕوانینە ئەو خەلیفە بەڕێزانە خوایان لێڕازی بێت.

٣٧. لەلاپەڕە (١٩٠)دا دەربارەی یەزیدی كوڕی مەعاویە دەڵێت "وتوویەتی هاشمییەكان گاڵتەیان بەپاشایەتی كردووە نە هەواڵیش هاتووەو نەوەحیش دابەزیوە".

دیسان لەسەرچاوەیەكەوە وەریگرتووە كە دژ بە خەلافەتی ئەمەوییەكانەو شایەتیش لە ناحەز وەرناگیرێت، بۆیە لێرەوە دەڵێین هەرگیز یەزید قسەی بەوشێوەیەی نەكردووە، بەڵێ بوونی یەزید بەخەلیفە دوای باوكی ڕێگەیەكی باش نەبوو بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە)و پاش ئەویش بوویە كارێكی باو، ئەمەش لەخۆیدا لادان بوو لەڕێگەی چوار خەلیفە ڕاشدەكە، بەڵام تاوانی بەو گەورەییەی لێناوەشێتەوە.

٣٨. لە لاپەڕە (١٩٣) (زەردەشتی) لە گێڕانەوەو وەرگێڕانی فەرموودەیەكی سەحیحدا دووجار هەڵە دەكات كە بەڵگەی چەندەها جارەیە لە سەر نەزانینی (زەردەشتی). فەرموودەكە وشەی (ملك) واتە فریشتەی تێدایەو زەردەشتی دەڵێت (پاشا).

لەفەرمووده‌كەدا (ان شاء الله) واتە ئەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، (زەردەشتی) وادەزانێت کە کردت بەکوردی دەبێت بە (ماشاء الله).

٣٩. لەلاپەرە (١٩٤)دا بێئەدەبیو تەشهیرکردنی بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ دەگاتە ئەوپەڕیو دەڵێت: "بوخاری نووسیویەتی قەتادە دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: پەیامبەر (موحەممەد) لەماوەی یەك سەعاتدا هەموو ژنەکانی خۆی بەسەر دەکردەوە کە ژمارەیان (١١) ژن بووە".

پاشان لەهەمان لاپەڕەدا دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: "ئەم فەرموودەیە (بەزمانی مەلاکان ئەم حەدیسە) یەکێکە لەو ڕیوایەتە پڕ مەهزەلانەی کە بوخاری تۆماری کردووە، چونکە ئەم ڕیوایەتە پەیامبەرێکی دونیانەویستی شەرواڵ پاکمان لێدەکات بە پیاوێکی شەرواڵ پیسی جنسیو دونیا پەرست کە جگە لە بەسەر کردنەوەی ژنەکانی خەریکی هیچی تر نەبێت!!".

خوێنەری بەڕێز سەیرێکی فەرموودەکەی ناو صەحیحی بوخاری بکە وەك خۆی: (عن قتادة أن أنس بن مالك حدثهم أن النبي ﷺ كان يطوف على نسائه في الليلة الواحدة وله يومئذ تسع نسوة).

قەتادە دەڵێت: ئەبوو هورەیرە بۆی گێڕاونەتەوە پەیامبەر ﷺ هەموو خێزانەکانی بەسەر دەکردەوە لەیەك شەودا کە ژمارەیان نۆ ژن بوون.

یەکەم: سەیری گۆڕانکاریو یاریکردن بەوشەکان لای (زەردەشتی) چۆنە؟

دووەم: پەیامبەر ﷺ ئەرکی پەیامبەرێتی بەکاملترین شێوە جێبەجێ کردووەو جێدەستی هەموو دونیای کۆنو تازەی سەرسام کردووە.

سێهەم: پەیامبەر ﷺ بەشایەتی خوا لەسەر بەرزترین پلەی ڕەوشتە (وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) (القلم: ٤). بوخاریو ڕاوی ئەم فەرموودەیەش ئەوەیان زانیوە، بەلاّم زەردەشتی لەفەرموودەکە تێنەگەیشتووە.

چوارەم: پەیامبەر ﷺ مرۆڤ بووەو فریشتە نەبووە، وەك هەموو مرۆڤێکی ساغ سیفەتە مرۆییەکانی تیدا بووە، ژن هێنانیشی نیشانەی مرۆڤیی پەیامبەرە ﷺ.

پێنجەم: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر دادپەروەرێتیو پاکی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانیداو لێرەوە سەیرێکی ئەو زاتە بکەو بەراوردی بکە لەگەڵ هەموو پیاوانی چەند ژنەدا..

شەشەم: "خێزانەکانی بەسەر دەکردەوە" ئەو واتایەی نییە کە (زەردەشتی) حەز دەکات وابێت، بەڵکو پێکەوە دادەنیشنو قسەی خۆشیو هەواڵ زانینی یەکترو هەموو ئەو واتایانەی لەوشەی بەسەرکردنەوەدا زهنی خوێنەری بۆ دەچێت.

کێ دەتوانێت وەك پێغەمبەر ﷺ بێت؟ئەوانەی کە شوێنی دەکەونو لاسایی دەکەنەوە تادێت زیاتر پێی سەرسام دەبنو خۆشترین کاتی ژیانیان باسکردنو سلاّواتدانە لەسەری، حەز بە مردنیش دەکەن بۆئەوەی بەو خۆشەویستە شادبن، هەروەك بیلال لەسەرەمەرگدا دەیوت:

غدا نلقى الاحبة، محمدا وصحبة.

بەیانی بەخۆشەویستانمان دەگەین، موحەممەدو هاوەڵەکانی.

٤٠. لەلاپەرە (١٩٦و ١٩٧)دا (خوێننامە) باس لە ڕاویو جۆرەکانی فەرموودە دەکات، سادەییو نەزانی نووسەر بەفەرموودەو حاڵی ڕاوییەکان لەنووسینەکەدا بەڕوونی دیارە، بۆ نموونە دەڵێت: "مەهزەلەی ئەو هەموو ڕیوایەتانە وایکرد کە ڕێچکەیەك بۆ فەرموودەی لاوازو سەحیحو..تاد دانێن، تا لەکاڵیو کرچی لایببەن بەم شێوەیان لێکردووەو ناویان ناوە (زانستی فەرموودە)".

١. متەواتر. ٢. مەشهور. ٣. صحیح. ٤. حەسەن. ٥. صالح. ٦. ضعیف. ٧. مرفوع. ٨. موقوف. ٩. تابعین. ١٠. مرسل. ١١. منقطع.. تاد".

خوێنەری هۆشیار:

١. زۆری ڕیوایەتەکان دەریدەخات کە هاوەڵانو تابعییەکان چەندە شەیدای پەیامبەر ﷺ بوونو جگە لە فەرموودەکانی شێوەی هەڵسوکەوت و جلوبەرگو تەنانەت هەڵوێستی لەکاتی بینینی ڕووداوێکدا چۆن بووە هەموو ئەمانەیان بەئەمانەتەوە نەقڵ کردووە.

٢. لەبەر بوونی هەڵپەو داوای زۆری چینی دوای تابیعی بۆ فەرموودەو سوونەتی پەیامبەر ﷺ، کەسانی هەلپەرستو ناحەز بە پەیامبەر ﷺ دەستیان کرد بە درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوەو بوویە هۆی کۆبوونەوەی کۆمەڵێك فەرموودەی هەڵبەستراو "موضوع".

٣. زانایان دەستیان کرد بەیاسادانان بۆ وەرگرتنی فەرموودە، بەپێی ئەو یاسایانە پلەی فەرموودەکانیان جیاکردەوە.

٤. زانستەکانی فەرموودە ئەوەندە وردبوو یاساکانیش ئەوەندە دروستو لەجێبوو "زانایانی فەرموودە" بەویستی خوا توانییان ئەوەی بۆیان دەهات تەتەڵەی بکەنو ڕاست لەناڕاست جیابکەنەوە.

٥. دابەشکردنی فەرموودە بەوشێوە نییە کە (زەردەشتی) باسی دەکاتو تەنها بەو دابەشکردنە ناوترێت: "زانستی فەرموودە"، بەڵکو زانستەکانی فەرموودە کە دەگەنە شەستو پێنج زانست وەك ئیمامی نەوەوی لەپەڕاوی "التقریب"دا باسی لێوە دەکات، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس بەکوردی پەراوێکی بەناوی (ڕێگەی ڕەهبەر) لەسەر زانستی فەرموودە دەرکردووە کەسێك بیەوێت لەزانستەکانی فەرموودەو بەنرخیی ئەو زانستە بزانێت با ئەو پەڕاوانە بخوێنێتەوە نەك چەند دێڕێکی زەردەشتی کە نەلەنەقلدا ئەمینەو نە خۆیشی شارەزایە لەو بووارەدا.

٤١. لەلاپەڕە (١٩٨) بۆ لاپەڕە (٢٠٥) (زەردەشتی) کۆمەڵێك فەرموودە لە "اقتران النيرين" دەردەهێنێتو بەمەبەستی گاڵتەکردن بەفەرموودە دەڵێت: "بۆ ئەوەی ڕەخنەی ئەوەش نەگیرێت کە کام فەرموودە تەواوەو کام فەرموودە زەعیفە، هاتووم هەمویم لەسەحیح موسلیمو سەحیح بوخاریی وەرگرتووە..ت.و".

(خوێننامە) فەرموودەکانی بەوەرگێڕدراوی نەقڵ کردووەو دەقەکەی نەنووسیوەو خۆشتان دەزانن وەرگێڕانەکانی (زەردەشتی) چونە، بۆیە کە گەڕامەوە سەر ئەسڵی دەقەکان دەزانم.

١. هەڵە لە زمانو وەرگێڕاندا هەیە.

٢. خیانەت لە نەقڵ کردندا.

٣. پەیوەست نەبوون بەیاساکانی گێڕانەوەی فەرموودە.

بۆ نموونە:

١. لە(خوێننامە)دا هاتووە لەلاپەڕە (١٩٨)دا" پەیامبەر وتی: "هیچ کەسێك نابێتە باوەڕدارێکی تەواو ئەگەر بێتو منی لەدایكو باوكو کوڕو کچو ژنو خزمو هەموو مرۆڤێكو هەموو شتێك خۆشتر نەوێت".

کاتێك سەیری سەحیحی بوخاریم کرد بەسێ ڕێگە ئەم فەرموودەیەی ڕیواتەت کردووە، لەهەر سێ ڕێگەکەدا دێڕی (کوڕو کچو ژنو خزمو هەموو مرۆڤێكو هەموو شتێك)ی تێدا نییە.

(زەردەشتی) نەیووتووە ڕاڤەی فەرموودە دەنووسم، وتوویەتی فەرموودە دەنووسم، دەبوو وەك خۆی بینووسێت، پاشان ڕاڤەکەی بنووسیایە.

ئەمەی (زەردەشتی) نووسیویەتی مانای فەرموودەکەیەو ڕاستە دەبێت باوەڕداران پێغەمبەریان لەهەموو ئەوانە باسکراون خۆشتر بوێت، چونکە ئێمە بڕوامان وایە:

أ. پێغەمبەر ﷺ لە باوكو دایكو خوشكو براو هەموو کەسێکمان نزیکترەو دڵسۆزترە، تەنانەت خۆیشمان: (النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم وأزواجه امهاتهم).

ب. پێغەمبەر ﷺ هۆی ڕزگاری ئێمەیە لەئاگرو ڕێگەی خێرو شەڕی پیشانداوین.

ج. زۆرماندوو بووەو ماندوو کراوە، لەگەڵ ئەوەدا هەموو پاڕانەوەیەكو داوایەکی بۆ بەرژەوەندی ئیمانداران بووە.

د. کەسی ڕەوشت بەرزو ئازاو لێبوردەو بەخشندە لەبەر زاتی خۆی خۆشەویستە، کەواتە چ شتێك لەفەرموودەکەدا جێگەی باوەڕ نەکردنە، یان مەهزەلەیە، مەگەر لای کەسانێك وابێت خۆشەویستی نەزانن و پێغەمبەر ﷺ نەناسن.

٢. کۆمەڵێك لەو فەرموودانەی تر کە زەردەشتی نەقڵی کردوون باس لە قیامەتو کاروباری غەیب دەکات. دیارە نەچووەتە عەقڵییەوە، لەبەرئەوەی باوەڕی بە پێغەمبەریی موحەممەد ﷺ لاوازە، بەڵام ئیمانداره‌کان لە دەرکەوتنو بەڕاست دەرچوونی شتە دیارەکانەوە باوەڕیان بە نادیارەکان هێناوە، تا خەڵکی لە ئاستی زانستو زانیاریدا پلەیان بەرز بێتەوە زیاتر باوەڕ بەشتە نادیارەکانی ناو قورئان دەکەن، چونکە بەزانستو زانیاریی بێگومان بوونو لەهەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺو شتە نادیارو داهاتووەکانیش ڕا بەدیارو بینراوەکان پێوانە دەکەن.

بۆنموونە: بەرپرسێکی ئەمریکی، دکتۆر ڕوبرت کرین، پاش تەمەنێکی زۆر لە ناوەندە باڵاکاندا هەر لەبەڕێوەبەرێتیی "مجلس أمن القومي"و لە "بيت الابيض"و بوون بە "سەفیر"و بەڕێوەبەرایەتی پارێزەرانو زانیدی زمانەکانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو ڕووسیو فەرەنسیو پاشان عەرەبیش.

لەگەڵ ئەمانەشدا تایبەتمەندێتیی وەرگرتووە لە "الانظمة القانونية المقارنة والاستعمار الدولي"دا، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا موسڵمان دەبێتو بەخەڵکیشی ڕادەگەیەنێت، ناوی خۆی لە (ڕوبرت کرین) دەگۆڕێت بۆ (فاروق عبدالحق).

خۆ ئەم پیاوە هەڵکەوتووە باوەڕی بەهەموو ئیسلام هێناوەو ئامادەبوو گۆڕانێکی سەرتاسەری بەسەر خۆیدا بهێنێتو تەنانەت ناوی خۆیشی گۆڕی بەناوێکی ئیسلامیی.

من پرسیار دەکەم بۆ لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانەوەو لەناوەندە باڵاکاندا خەڵکانێکی زۆر بەرەو ئیسلام دێن، کەسێکی نەشارەزای وەك (زەردەشتی) فەرموودەکانی پەیامبەر ﷺ بەمەهزەلە دادەنێت!!

٤. لەلاپەرە (٢٠٢)دا فەرموودەیەکی ئیمامی عەلی دەگێڕێتەوەو هەندێکی مەقسەت لێدەداتو واخوێنەر حاڵی دەکات ئیمامی عەلی داوای کەنیزەك دەکات لە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆیەتیو دەڵێت: "عەلی کوڕی ئەبی تالیب بە پەیامبەر دەڵێت: بیستومە کۆمەڵێك کۆیلەو کەنیزەکت بۆ هاتووە، بەڵکو دوانم بەیتێ.. پەیامبەریش دەڵێ: (٣٣) جار بڵێ (الله أكبر) (٣٣) جار بڵێ (سبحان الله)، (٣٣) جار بڵێ (الحمد لله)، ئەوە لە خزمەتکار بۆ ئێوە چاکترە".

ئێستە سەیری ئەسڵی فەرموودەکە بکە: (عن علي أن فاطمة عليها السلام شكت ماتلقى في يدها من الرحى، فأتت النبي ﷺ تسأله خادما فلم تجده، فذكرت ذلك لعائشة، فلما جاء أخبرته قال قال فجاءنا وقد أخذنا مضاجعنا فذهبت اقوم فقال مكانك فجلس بيننا حتى وجدت برد قدميه على صدري، فقال الا أدلكما هلى ماهو خير لكما من خادم اذا أويتما الى فراشكما أو اخدتما مضاجعكما فكبر ثلاثا وثلاثين وسبحا ثلاثا وثلاثين واحمدا ثلاثا وثلاثين فهذا خير لكما من خادم).

عەلی دەڵێت: فاتیمە (سەلامی خوای لێبێت)، سکاڵای ماندووبوونی دەستەکانی کرد لەزۆری دەستاڕکردنیو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای خزمەتکارێکی لێبکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەماڵ نەبوو، حاڵی خۆی بۆ عائیشە باسکردو عائیشەش کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتەوە هەواڵی فاتیمەی پێدا.

عەلی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵمان ئێمە لەسەر جێبووین، ویستم هەستمەوە لەبەری، فەرمووی لەجێی خۆت مەجوڵێو لەنێوانماندا دانیشت، هەستم بەساردی پێکانی دەکرد لەسەر سنگم، فەرمووی ئایا شتێکتان پێنەڵێم کە باشتر بێت بۆتان لەخزمەتکار؟ ئەگەر ڕووتان کردە پێخەفەتەکانتانو هەریەکەتان چوون ناو جێگەکەتانەوە (٣٣) جار (الله أكبر) بکەنو (٣٣) جار (سبحان الله) بکەنو (٣٣) جار (الحمد لله) بکەن، ئەمە لە خزمەتکار بۆ ئێوە باشترە.

ئەم فەرموودەیە چەندەها پەندی تێدایە، دوایی خوێنەری بەڕێز بزانە مەهزەلەیە (پەنا بەخوا) یان پڕ لە حیکمەتو گەورەیی پێغەمبەر ﷺ.

أ. کچی پێغەمبەر ﷺ، خاوەنی دەوڵەتی ئیسلامیو سەرکردەو جێنشتەی هەموو دڵەکانی چواردەوری، وەك هەموو ژنێکی هەژار خۆی ئیشی ماڵی خۆی دەکاتو منداڵ بەخێو کردنو گەنمو جۆ هاڕین بەدەستاڕو هەموو ئیشێکی تر، ماندووی دەکات کاتێك داوای سادەترین یارمەتی دەکات لەو دەوڵەتە وەڵامەکەی نەخێر دەبێت لەلایەن باوکییەوە کە خاوەنی دەوڵەتەکەیە، سەیرێکی بەرپرسانی ئێستەو سەیرێکی پێغەمبەر ﷺ بکە.

ب . بەجێهێنانی ئەرکی باوکێتیی پێغەمبەر ﷺ کە سەردانی ماڵی کچەکەی دەکاتو دڵنەوایی دەکاتو قەناعەتی پێدەکاتو باشتر لە خزمەتکاری پێشکەش دەکاتو دەیەوێت کچەکەیشی وەك خۆی بێت، لەڕووکردنە قیامەتو دونیانەویستیدا.

ج . ئیبن تەیمییە دەڵێت لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێت "هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەر ئەو زیکرە لەکاتی خەوتندا تووشی ماندووبوونی جەستەیی نایەت، چونکە فاتیمە سکاڵای شەکەتی خۆی کردو پەیامبەر ﷺ بەوە ئامۆژگاری کرد".

د . لە خێزانی پێغەمبەر ﷺدا، واتە نێوان فاتیمەو عائیشەو عەلیو پێغەمبەردا خۆشەویستی لێك تێگەیشتن هەبووە.

٤. لەژمارە حەوتی فەرموودەکانی (زەردەشتی)دا فەرموودەیەکی هێناوەو بەئارەزووی خۆی بەمشێوەیەی لێکردووە".

پەیامبەر لەبەر چاکی لەکەسی نەداوە، دڵی نەهاتووە ئەزیەتی هیچ کەسێك بدات، بەڵام هەرکەسێك خراپەی کردبێت داری حەددی لێداوە، ڕەجمی کردووە، دەسو پێی بڕیووە". دەڵێت "لە بوخاری موسلم"دا هەیەو ژمارەی فەرموودەکانیش دەهێنێت بۆ زانینی خوێنەر لە بوخاریدا بەمشێوەیە ئەم فەرموودەیە هاتووە.

عن عائشة (رضی الله عنها) أنها قالت: ماخیر رسول الله ﷺبین أمرین الا أخذ أیسرهما مالم یکن أثما فان کان اثما کان ابعد الناس منه، وما انتقم رسول الله ﷺلنفسه الا أن تنتهك حرمة الله، فینتقم لله بها"[1].

لە موسلیمیشدا بەمشێوە هاتووە: "عن عائشة قالت: ما ضرب رسول الله ﷺشیئا قط بیده ولا امرءة ولا خادما، الا أن یجاهد في سبیل الله مانیل منه شئ قط فینتقم من صاحبه الا أن ینتهك شئ من محارم الله فینتقم لله عز وجل"[2].

لەهەردوو ڕیوایەتەکەدا ئەو دێڕەی کۆتایی خۆی چنیویەتی، بۆچی؟ پێغەمبەر ﷺ ئەزیەتی کەسی نەداوە، ئەگەر ئەزیەتیش درابێت تۆڵەی نەکردۆتەوە، ئەگەر باسی بەزەییو نەرمیو خۆش مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ بکەیت پەراوێکی تایبەتی دەوێت. پێم وابێت دیراسەکردنی ئەو چەند فەرموودەیە بە سبێت کە خوێنەر بزانێت (زەردەشتی) نووسینەکەی لەم بەشەشدا پێچەوانەی نووسینی ئەکادیمییە، پێی ناوترێت لێکۆڵینەوەو پڕە لە گاڵتەکردن بە عەقڵی خوێنەرو ڕاستییەکانی ئاوەژوو کردووە.

---

[1] ارشاد الساري لشرح صحیح البخاري ج٦، ص ٣٢.

[2] ارشاد الساري لشرح صحیح البخاري ج٩.

(خوێننامە) لەسەرەتای ئەم بەشەیدا کە لە لاپەڕەکانی (٢٠٥) بۆ (٢٠٨) دەگرێتەوە

٤٢. سەرەتا باس لەوە دەکات کە ئایینزاد حەقی خۆیەتی وەك بوونەوەرێکی هۆشیار هەست بکاتو بەئارەزووی خۆی لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا هەڵبژێرێت یان زەتبکاتەوەو هەقی خۆیەتی بەناوەندەکانی هەقو ڕاستییدا بەهەندێکیان بڵێت ئێوە باشن بەهەندێکی دیکەشیان بڵێن ئێوە باش نین.

پاشان دەڵێت: "کاتێك باوەڕ لەئاسمانەوە دێتە خوارەوە بەرزو پیرۆزی خۆی لەئاسمانەوە بۆ زەوی نزم دەکاتەوە، بەهای خۆی لەدەست دەدات، باوەڕ بوون بەهێزی ئاسمان دەبێت لەسەر بنەمایەك پێك بهێنرێت کە دوور بێت لەپێناسەی ئەقڵی مرۆڤەوە، هەر پێناسەیەك بۆ هێزی باڵا بکرێت ئەو پێناسەیە چەند بەرزو بڵند بێت هەر ناگاتە پلەو پایەی هێزی باڵا.. ت..و".

کاکی (زەردەشتی) ئەو مافو هەققانەی کە تۆ ئێستە باسی لێدەکەیتو دەیدەیتە مرۆڤ، باوەڕی ئیسلامیی پێش (١٤٠٠) ساڵ ئەو مافانەی بەخشیوە بەمرۆڤ، بەڵکو خاوەنی زەویو ئاسمانەکان لەگەڵ درستبوونی مرۆڤدا ئەو مافە کە مافی هەڵبژاردنی ڕێگەی ژیانە بە خشیویەتی بەئاوەدانیو لەگەڵ بوونی توانای بێ سنووریدا باوەڕی بە زۆر نەسەپاندووە بەسەر کەسداو مرۆڤ بەکاملی ئیختیاری خۆی یەکێك لەدوو ڕێگاکە هەڵدەبژێرێت، یان ڕێگای قبوڵکردنی تەعلیمەکانی ئاسمان یان ڕێگای مرۆڤکرد.

خوا دەفەموێت (إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً) (الإنسان: ٣). واتە: ئێمە ڕێگاکانمان پیشانی مرۆڤداوە، ئیتر مرۆڤە کە وپاسگوزار دەبێت یان کافر.

(فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُر). هەرکەسێك ویستی با باوەڕ بهێنێتو هەرکەسێك نەیویست با کافر بێت. (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ٢٥٦). بەڵام بۆ جۆری هەڵبژاردنەکە تۆ بەهەڵەدا چوویت، کاتێك مرۆڤ ڕێگەی باوەڕ هەڵدەبژێرێتو بەیەقین بۆی دەردەکەوێت کە ڕاستە. دەبێت باوەڕەکەی پارچە پارچە نەکاتو باوڕە بەهەمووی بکات، چونکە باوەڕدار پێش ئاسمانەکانو زەوییەو ئەوەی لەنێوان ئاسمانەکانو زەوی دایە. خوایەك کامڵی عیلمی هەیەو هەرچی فەرمووبێت هەر ئەوە ڕاستو دروستەو لەبەرژەوەندی دونیاو پاشەڕۆژی مرۆڤە.

خوایەك بەڕەحمترە بۆ هەر تاکێك لە مرۆڤەکان لە دایكو باوکی ئەو مرۆڤە، خوایەك مرۆڤی بەهرەدار کردووە بەناردنی قورئان بۆ دەرهێنانی مرۆڤ، لەتاریکی بۆ ڕووناکیو لەنەزانینو جەهل بۆ زانینو بەرچاوڕۆشنی، کاتێك باوەڕدار ئەو خاوەنەی ناسی ئیتر چۆن لەخۆی دەبوورێت، دەستبژێری فەرموودەکانی ئەو بێ هاوتایە بکاتو خوا خۆیشی دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً) (الأحزاب: ٣٦).

واتە: "ئیماندار هەقی ئەوەی نییە پاش ئەوەی خوا بڕیارێکیدا دەستبژێری بکات". بۆ وەڵامی ئەوەش کە دەڵێیت باوەڕ ئەگەر لەئاسمانەوە دابەزی بۆ زەوی بەرزو پیرۆزی لەدەستدەدات. ئەوە بێڕێزییەکی زۆرە بەرانبەر بەخۆت کە مرۆڤیت، چونکە خوا ڕێزی لەمرۆڤ گرت کاتێك خۆی پێناساند.

بەڵێ باوەڕ لەئاسمانەوە دابەزی، بەڵام دابەزینەکەی ڕێزلێنانو بەرزکردنەوەی مرۆڤ بوو بۆ ئاسمانو پەیوەست کردنیبوو بەهێزی باڵاوە.

(وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە ئادەمییەکان گرت. ڕێزی خوایش بەناردنی فەرمانو ڕێنموونییەکانیەتیو پاشان ڕێزی لەژێری ئیرادەی مرۆڤیش گرتووە، بەوەی هەڵبژاردن یان ڕەتکردنی دەداتەوە دەستی مرۆڤ، ئەگەر تۆ لە مرۆڤ ڕانابینی ئەو ڕێزەی لێبگیرێت، ئەوا خوا لەتۆ بەڕەحمترەو ئەو ڕێزەی لەمرۆڤ گرتووە.

٤٣. لەلاپەڕە (٢٠٧) نموونەیەك دەهێنێتەوەو دەڵێت: "بۆ نموونە لەکتێبی ئایینیدا نووسراوە، هێزی باڵا توانای چەند کارێکی هەیە کە مرۆڤ هێزی بەسەردا ناشکێت، بەڵام کە زانست بۆیدەرکەوت کە کەیو چۆن باران دەبارێو چی لە سکی

دایکدایە، چەمکەکە ئاوەژوو دەبێتەوەو هێزی باڵا لە لەشی مرۆڤدا بەرجەستە دەبێتو هۆکارەکانی دروستبوونی باوەڕ بەرەو نزم بوونەوە دەچێت، بۆیە بەستنەوەی باوەڕە بە دیاردە سورشتییەکانەوە هۆکارێکە بۆ توانەوەی باوەڕ، چونکە ڕۆژ بەڕۆژ زانست داهێنانی نوێ دەهێنێتە ئاراوە، ئەوەی ئێستا بەعەقڵ ئاشنا نییە ماوەیەکی دیکە دەبێتە حاڵەتێکی ئاسایی و بەرجەستە بوونی لەمرۆڤدا.. ت.. و".

نازانم (زەردەشتی) لێرەدا ئاگای لەوە نییە کە لە جیاتی ئەوەی ئەم نموونە ببێتە بەڵگە بۆی، دەبێتە بەڵگە لەسەری، بەڵێ خوای گەورە کە تۆ بەهێزی باڵا تەعبیری لێ دەکەیت توانای چەندەها کاری هەیە کە مرۆڤ هێزی بەسەردا ناشکێت.

زانست بۆی دەرکەوتووە کە باران چۆنو کەی دەبارێتو باوەڕی ئایینیش ئەمەی بۆ مرۆڤ باسکردووەو خوێندنەوەو باوەڕ بوونیشی کردوویەتییە هۆکارێك بۆ بەرزبوونەوەی پلەی باوەڕ.

لە سوورەتی "النور"دا دەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ) (النور: ٤٣). یان دەفەرموێت: (وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجاً) (النبأ: ١٤).

خوای گەورە زانینی باران بارینی لەمرۆڤ قەدەغە نەکردووە، بەڵکو تێڕامانو دیراسەکردنی کردۆتە ئەرکێکی ئایینی و ڕەخنەش لە کەسێك دەگرێت کە بەسەر ئەو ڕووداوانە "شەوو ڕۆژ، باران بارین، شەپۆلەکانو تاریکی ناو دەریا ئاسمانەکانو زەوی، جۆراوجۆری زمانەکان، شێوەو ڕەگەزی مرۆڤەکان"، تێدەپەڕنو بیری لێناکەنەوەو دیراسەی ناکەن[1].

بەڵێ زانست چۆنێتیی و کاتی باران بارینی بۆ دەرکەوتووە، ئیماندارانیش باوەڕیان بەوە زیاتر پتەو بووە، چونکە موحەممەدێکی نەخوێندەوار زیاتر لە هەزار ساڵ پێش زانست ئەمەی باس کردبێت، دەریدەخات کە موحەممەد تەنها گەیەنەر بووەو قورئانیش لای دروستکاری ئاسمانەکانو زەوییەوە دابەزیووە.

بەڵام ئایا زانست تا ئێستە توانیویەتی باران بارانەکە بپارێزێت؟ یان ئایا توانیویەتی ڕێگری لەبارینی بکات.

دروستبوونی زریانو لافاو پێشبینی دەکرێتو ژێری مرۆڤ ئەگەرەکانی ڕوودانی زیانەکانی باسدەکات، بەڵام ئایا توانای ڕێگری لێ هەیە؟! لافاوەکانی ئەم چەند ساڵەی "ئەمریکا" لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەدا لەبواری زانست چەندێك توانییان ڕێگری لێ بکەن؟!

ئایا تەرزەو لافاو کە خراپەو بارانو بەفر کە خێرە، بارینو ڕوودانیان بەدەستی کێیە؟ جگە لەخوا؟ ئیتر چۆنو لەکوێ هێزی باڵا لەمرۆڤ بەرجەستە بووە؟

پاشان کە باس لەمناڵی سکی دایك دەکەیت کە مرۆڤ دەزانێت چییە؟ بەڵێ مرۆڤ بەهۆی زانستی نوێوە دەزانێت و چەندەها کەسی بەئەزموونیش هەر بە گەورە سەیرکردنی زانستە، بەڵام ئایا زانست لە خەلق کردنیدا دەستی هەیە؟ بۆ پزیشك هەیە پسپۆڕە لەزانستی مناڵداو کەچی مناڵی نابێت؟ یان بۆ هەیە هەر کوڕی دەبێت و هەیە بەپێچەوانەوەو هەشە هەردووکیانی هەیە بەبێئەوەی ویستی خۆیانی تێدا بێت.

ئایا زانست توانیویەتی ڕێگری لەبوونی مناڵی کەمئەندام بکات؟ یان ئایا کەم ئەندامێکی زکماکییان چاك کردۆتەوە؟

شتێکی زانستی سادەی وەك باران بارینو مناڵی سکی دایك مرۆڤ تیایدا دەستەوسانە! ئەی دروستکردنی ئاسمانەکان بەو هەموو ئەستێرەو خۆرو مانگەوەو دروستکردنی ئەم زەوییەی لەسەری دەژین کە لەدروستبوونی مرۆڤەوە تا ئێستە بەشی پێویستی مرۆڤ بەزیادەوە خواردنو بژێوی تێدایە، دەسەڵاتی مرۆڤ لەکوێی ئەمانەدا دەوەستێت یان پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ کە مرۆڤ ناگاتە زانینی هەموو نهێنییەکانی چ جای دروستکردنی.

ئەو زانستەی تۆ باسی دەکەیت لەکوێو دەسەڵاتو توانی خوا لەکوێ!! ئێستە زانیت زانستو توانای دەسەڵاتی باڵا (خوا) لە جەستەی مرۆڤدا بەرجەستە نابێت.

[1] بۆ زانینی نیشانەکانی خوا لە باران بارینا سەیری پەڕاوی "كتاب التوحيد" عەبدالمجید زندانی بکە.

ئەوەی کە تۆ باست کردووە شتێکی زۆر کەمە لەو زانستەی لە قورئاندا هاتووەو بۆتە هۆی بەرزکردنەوەی پلەی باوەڕی ئایینی.

٤٤. (خوێننامە) لەلاپەڕە (٢٠٩)دا لەبابەتی سایکۆلۆژیەتی دیاردەی باوەڕدا دەڵێت: "ترس و دڵە ڕاوکێ و گومان کە سێ مانای جیاوازو سێ هۆکارو سێ دەرەنجامی جیاواز بەدەستەوە دەدەن، هەریەکەیان لە پانتاییەکی بەرفراواندا ماناو لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەو سەربەخۆیان هەیە، لەباوەڕدا پەیوەندییەکی زۆر بەهێزو تۆکمەیان پێکەوە هەیەو هەرسێکیان دەبنە هۆی دروستبوونی باوەڕە.." خوێنەری بەڕێز سەیر بکە چۆن لەخۆیەوە پایەکانی باوەڕ دیاریی دەکات (ترس، دڵەڕاوکێ، گومان)، نازانم لەکوێوە ئەمەی هێناوە، ئێمەی باوەڕداران کە بە فیعلی باوەڕمان هێناوە شتی وامان نەدیوەو پێچەوانەکەی دەزانێت.

قورئان و فەرمودەش لەبەشی باوەڕدا هەوڵیانداوە مرۆڤێکی دڵپڕ لە یەقینی ئازای دڵئارام دروست بکەن نەك ئەو مرۆڤە شێتەی (زەردەشتی) (تصور)ی دەکات.

من چەند ئایەت و فەرموودەیەك کە باوەڕی ئیسلامی و پایەکانی دیاری دەکات دەسەلمێنم و پاش ئەوەش دەردەکەوێت نرخی زانستی پایەکانی (زەردەشتی) چەندێکە:

١. باوەڕ لەقورئان و فەرموودەدا زاراوەی (الایمان)ی بۆ بەکار دەهێنرێت و ئەم وشەیەش لە فەرهەنگدا ئەم واتایەی هەیە:

أمن: امنا وامانا وأمنة"، اطمئنَ.

امن: امنا امنة: وثق به فهو مؤمن.

وآمن ایمانا به: صدف ووثق به[1].

کەواتە ئیمان: دڵئارامی، بەڕاستگێڕان، متمانە پێکردن.

٢. خوا دەفەرموێت: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا..) (الحجرات: ١٥).

ئەوانە ئیماندارن کە ئیمانیان بەخواو بە پێغەمبەر ﷺ هەیەو پاشانیش دوودڵ نین، کەواتە بوونی باوەڕ دەبێتە هۆی نەمانی دڵەڕاوکێ.

٣. خوا دەفەرموێت: (أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ) (یونس: ٦٢).

بۆ ئاگاداری وەلییەکانی خوا ترسیان لەسەر نییەو دڵگران نابن. کەواتە نیشانەی باوەڕیش نەمانی ترس و دڵگرانییە.

٤. (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (المائدة: ٥٠). (وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (الجاثیة: ٤). (هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (الجاثیة: ٢٠).

لەئایەتی یەکەمدا دەریدەخات کەسانێك فەرمانەکانی خوا قبوڵ دەکەن کە یەقینیان هەیە، لەئایەتی دووەمدا دروستبوونی ئادەمی و هەرچی بەسەر زەویدا دەڕوات لەگیاندارانی تر نیشانەو بەڵگەن بۆ ئەوانەی یەقینیان هەیە[2].

لەئایەتی سێیەمیشدا دەریدەخات ئەم قورئانە مرۆڤ بەرچاو ڕۆشن دەکات و ڕێنموونی دەکات و بەزەیی خواییە بۆ ئەوانەی یەقینییان هەیە، ئیتر گومان چۆن دەبێتە پایەی باوەڕی ئیسلامیی.

لەو باسەی پێشەوە دەرکەوت کە ئیماندار ئازایەو ئارامەو دڵپڕ لە یەقینەو پێچەوانەی بۆچوونەکەی (زەردەستی)یە.

لە قورئان و فەرموودەدا کۆڵەکەکانی باوەڕ بریتییە لە باوەڕبوون بەخواو فریشتەکان و پەڕاوە ئاسمانییەکان، پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بەڕۆژی دوایی و بەقەدەری چاك و خراپ. جا ئەم بڕوا بوونە لەناخی مرۆڤدایەو دیار نییە، دەبێت دەرئەنجامەکانی ئەو باوەڕە بەڕاست بگێڕن، پێغەمبەر ﷺ لەپێناسەی باوەڕدا دەفەرمووێت بریتییە لە

---

[1] المنجد في الأعلام واللغة.

[2] بیرکردنەوە لە خەلقی مرۆڤو زیندەوەران لە قورئاندا داوا کردووەو پەی بردن بەنهێنییەکانی یەقین لەمرۆڤدا دروست دەکات بەخالقی مرۆڤ زیندەوەران، بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی (زەردەشت) وەك لەپێشەوە تیشکمان خستە سەری.

(ماوقر في القلب وصدقه العمل) لەدڵدا جێگیر دەبێت کردەوە ئەندازەی باوەڕەکە دیاریدەکاتو دەبێتە بەڵگە بۆ بوونی باوەڕەکە".

لەنیشانەکانی بوونی باوەڕ کە لەخۆمانەوە نایڵێین وەك (زەردەشتی)، بەڵکو بەڵگەی لەسەرە لەئیسلامدا.

١. دەستپاکیو زمانپاکیو خیانەت نەکردنو ئاشتیخوازی. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (االمسلم من سلم المسلمون من لسانه ویده، والمؤمن من أمنه الناس على دماءهم وأموالهم).

٢. ئارامیو لێبووردەییو تێکەڵبوون بەکۆمەڵگەو زمان شیرینیو ڕەوشتبەرزی. قیل لرسول الله ﷺما الاسلام: قال أطعام الطعام وطیب الکلام قیل فما الایمان؟ قال السماحة والصبر، قیل فمن أفضل المسلمین اسلاما، قال من سلم المسلمون من لسانه ویده. قیل فمن أفضل المؤمنین ایمانا قال احسنهم خلقا.

٣. بەرژەوەندی خەڵکی لەبەرچاو گرتنو وەك خۆ حیساب بۆ کردنیان.

"قال رسول الله ﷺ: لایؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه".

٤. ڕێز لەمیوان گرتنو ئازار نەدانی دراوسێو باش گوتن.

"من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیکرم ضیفه ومن کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلا یؤذی جاره..".

٥. خۆشەویستیو بڵاوبوونەوەی سەلام. لە صەحیحی موسلیم-دا هاتوو: "والذي نفسي بیده لاتدحلوا الجنة حتی تؤمنوا ولا تؤمنوا حتی تحابوا اولا ادلکم على شئ اذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بینکم".

ئەمانەو چەندەهای تر لە بەرهەمو نیشانەکانی باوەڕی ئیسلامین کە لەسەدا سەد پێچەوانەی ئەوانەی (زەردەستی)یە. من نازانم زەردەشتی باسی کام باوەڕە دەکات؟ ئەوەی دەیزانم ئەوە باوەڕی ئیسلامی نییەو لەکوێی هێناوە؟ "ماڵی قەڵب سەر بەساحێبییەتی!".

جگە لەمانەش (زەردەشتی) ئاگای لەزانستی تازە نییە کە باوەڕ هێنان چۆن دەبێتە چارەسەر بۆ زۆربەی نەخۆشییە دەروونییەکان. بۆنموونە: هندۆسەکان لە هندستان کە باوەڕیان بەخواش نییە بەزانست بۆیان دەرکەوتووە کە گوێگرتن بۆ بانگ لە مزگەوتەکانو لەو پێنج کاتە جیاوازەدا، زۆرێك لە نەخۆشییەکان چارەسەر دەکات، بۆیە لە یەکێك لە بیمارستەکانیاندا وەك چارەسەر بەکاری دەهێنن[1].

داوا لە خوێنەرانی بەڕێزی (زەردەشتی) دەکەم کە زانسییانە لەبیستراوەکان بکۆڵنەوەو باوەڕ بەقسەی بێبناغەو بێبەڵگە نەکەن.

سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ ڕۆژێکە زۆر بەئاسانی ڕاستیو ناڕاستی شتەکان ڕوون دەبێتەوە بەهۆی بوونی خزمەت گوزارییەکانەوە، بەئاسانی لەڕێگەی ئەنتەرنێتەوە قسە لەگەڵ پیاوانی هەڵکەوتوو زاناکان دەکرێت بە ئسلوبی زانستیانەی سەردەم گەورەیی باوەڕی ئیسلامیو قورئان ئاشکرا دەکەن.

٤٥. لەلاپەڕە (٢٤٤)دا دەڵێت: "بەهۆی چەندین شێوەی ڕێوڕەسمی تایبەتو چەندین پەیڕەوی جیا جیا دیاردەی باوەڕ گۆڕا بۆ چەمکی ئایینو ئایین لەدوای ئایین دەرکەوتو قوناغ لەدوای قۆناغ ئایینی نوێ دروستبوون، هەر ناوچەو شوێنێك بۆ خۆیان بوونە خاوەنی پەیڕەوی یەکێك لە ئایینەکان".

(زەردەشتی) لەلاپەڕەکانی پێش ئەم قسانەدا زۆر بەکورتیو بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەك باس لەبیروڕاکانی ئەقڵی سەرەتایی دەکات لەپڕو بێ موناسەبە بازێکی گەورە دەداتو لەباسی چۆنێتیی پەرستنی بەردو دارو خۆرو ئەستێرەو موورووەوە گەیشتە ئەوەی بڵێ دیاردەی باوەڕ گۆڕا بەئایینو ئایین لەدوای ئایین دەرکەوتن.

تەنانەت لەباسەکەیدا خۆی نەدا لەباسی پیاوە زۆر عاقڵەکانی ناو مێژوو کە بەژیری خۆیان خوای تاكو تەنیایان ناسیو بەسەیرکردنی بوونەوەردا سیفاتەکانی خوایانزانی، وەك: "ئەخناتون لەمیسر، بەرهام لە هیند، کنفیشیوس لە چین"، فەیلەسوفەکانی یۆنانیش وەك "أرسطوا، سقراط، افلاطون".

---

[1] د. یوسف البدر، کەناڵی (سمارت وەی) Samart way.

ئەم پیاوە هەڵکەوتوانە باس ناکات، چونکە باسکردنی ئەمانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەعالیمەکانی ئایینی ئیسلام لەگەڵ "عەقڵی سەلیم"دا ڕێك دەکەوێت، نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو چەندەها باسی تێدایە بەدەرە لەهەموو ژیرییەك و لەهەموو توانایەك کە شایەتن لەسەر ئەوەی کەلای خواوە هاتووە، ئایینی ئیسلام‌و بیروباوەڕەکەی بەپێنج بەڵگە دەسەلمێنرێت کە دانراوی خوایەو دوورە لەو باسەی کە (زەردەشتی) دەیەوێت بیڵێت، هەرچەندە لەبەر نامۆیی‌و نەگونجاوی باسەکەی نەیتوانیوە بەڕاشکاوی ئەوە بڵێت‌و ئەگەر ئیحتمالی گونجاوی لە (١٪)ی هەبووایە بەشێوەیەك لەشێوەکان دەیوت.

وەك بیرخستنەوەیەکی خوێنەر باسێکی کورتی ئەو بەڵگانە دەکەین کە دەبنە شایەت لەسەر ئەوەی ئایینی ئیسلام لەلای خواوە هاتووە:

یەکەم: ئەو ڕەوشت‌و ئاکارو کردەوانەی کە پێغەمبەری ﷺ لەسەر بوو پێشئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ﷺ‌و پاشبوونیشی بە پێغەمبەرﷺ.

دووەم: تێرو تەسەلی شەریعەتی ئیسلام.

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ‌و شوێنکەوتووانی لەگەڵ کەمی ژمارەو لاوازی دەسەڵاتیان بەگژ شیرك‌و دەسەڵاتدارانذا چوونەوەو سەرکەوتنیان بەدەستهێنان‌و لەپاش خۆیشی ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو فراوانبوون چوو.

چوارەم: پاش ماوەیەکی زۆر لە پچڕانی وەحی‌و پێغەمبەرایەتی دەرکەوت.

پێنجەم: ئەو مژدەو هەواڵانەی لەکتێبە ئاسمانییەکانی پێش ئیسلامدا هاتوون.

لەبەر ئەوەی بەڵگەی دووەم لەگەڵ باسەکانی (زەردەشتی)دا دەگونجێت‌و بوختانەکانی (خوێننامە) بەتاڵ دەکاتەوە کەمێك بەدرێژتر لەسەری دەنووسین.

تێرو تەواوی شەریعەتی ئیسلام

پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك چۆن لەپێشەوە باسمان کردو بەبەڵگە سەلماندمان کە نەخوێندەوار بووە، لەناو گەلێکی زیاتر نەفامدا پەروەردە بووە، بەڵکو سەردەمی پێش پێغەمبەرێتیی چەندەها ڕۆژ بەتەنیا لەئەشکەوتی حەرادا بیری دەکردەوە لەگەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا.

کاتێك سەیری شەریعەتی ئیسلام دەکەین کە هەموو لایەنێکی ژیانی بەشەری تێدا باسکراوە، بێگومان دەبێت لەوەی نەك مرۆڤێکی نەخوێندەواری وەك (موحەممەد)، بەڵکو هەڵکەوتوان، ئەوانەی هەموو هۆکارێکی فێربوونی زانیارییان لەبەر دەستدایە دەستەوسانن لەهێنانی وێنەی ئەو شەریعەتە کە بەکەڵکی هەموو گەل‌و نەتەوەو زەمانێك دێت، دەردەکەوێت کەلای خوایەکی زانای ئاگادارەوە هاتووە بۆ پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ﷺ.

بابەتەکانی قورئانی پیرۆز دەکرێن بەدوو بەشەوە ئەحکام‌و جگە لەئەحکام، ئەوانەی جگە لە(ئەحکام)ن سێ بەشن:

١. ڕێنموونی بۆ تێڕامان‌و بیرکردنەوە لە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و زانینی نەهێنی دروستکراوەکان، کە ئەمە ڕێگەیەکی پیرۆزە بۆ بەرەو پێشچوونی زانست‌و زانیاری‌و زانایانی وڵاتە پێشکەوتووەکان، لە ڕێگەوە زۆرێك لەنهێنییەکانی بوونەوەیان بۆ دەرکەوتووە، لەئەنجامیشدا خزمەی زۆریان بەمرۆڤایەتی کردووە.

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاء مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) (البقرة: ١٦٤)[١].

٢. چیرۆکی گەلانی ڕابردوو کە بۆ پەند لێوەرگرتنە.

٣. پاداشت‌و تۆڵەی خوایی، لەدونیاو قیامەتدا.

[١] (البقرة: ١٦٤).

نموونەی تۆڵەی دونیایی: (وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ) (النحل: ١١٢)[١].

نموونەی پاداشتی خوایی لەدونیادا: (..يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ..)[٢].

نموونەی پاداشتو تۆڵەی خوایی لە قیامەتدا: (تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ، وَمَن يَعْصِ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَاراً خَالِداً فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ) (النساء: ١٣ ـ ١٤)[٣].

ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆزیش (٣) بەشن:

١. ئەحکامەکانی بیروباوەڕ کە باس لەباوەڕبوون بەخواو فریشتەکانو پێغەمبەرانو پەڕاوە ئاسمانییەکانو باوەڕبوون بەڕۆژی دواییو باوەڕ بوون بەقەدەری خوا دەکات.

٢. ئەحکامەکانی خووڕەوشت: باس لەخۆڕازاندنەوە دەکات بەکردەوە چاکەکانو وازهێنان لە کردەوە خراپەکان.

٣. ئەحکامەکانی کارو کردار، ئەمیش دوو جۆرە:

أ. ئەحکامی خواپەرستی: کە پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگار ڕێکدەخات لەنوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو .. هتد.

ب. ئەو ئەحکامانەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگەو مرۆڤەکان ڕێکدەخات، ئەمانیش چەند جۆرێکن:

١. حوکمەکانی ئەحوالی شەخسی کە پەیوەندی بە "خێزانو ژنهێنانو تەڵاق"ەوە هەیەو نزیکەی (٧٠) ئایەتن.

٢. حوکمەکانی پەیوەست بە مەدەنییەت لەکڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو لەئەستۆگرتنو شەریکایەتی، ئەمانیش نزیکەی (٧٠) ئایەتن.

٣. حوکمەکانی خیانەتو تاوان پەیوەست بە تۆڵەو سنوورەکان بۆ پاراستنی ژیانی خەڵکیو پاراستنی مالو سامانو ناموسی خەڵکیو ئایەتەکانی نزیکەی (٣٠) ئایەتن.

٤. حوکمەکانی شکاتکاری "المرافعات" پەیوەست بەدادگاو شایەتیو سوێند خواردن، بۆ پاراستنی دادوەری کۆمەڵگا، ئایەتەکانی (١٣) ئایەتن.

٥. یاسا دەستوورییەکان پەیوەستن بەڕێکخستنی فەرمانڕەوایەتیو بنچینەکانی فەرمانڕەوایەتیو (١٠) ئایەتن.

٦. حوکمەکانی دەوڵەتداری کە پەیوەستن بەهەڵسوکەوتی دەوڵەتی ئیسلامیی بەباقی دەوڵەتەکانی ترەوە، ئایەتەکانی نزیکەی (٢٥) ئایەتن.

٧. یاسا ئابوورییەکان کە پەیوەستە بەمافی مامخوراوانو نەدارو بێنەوایان لەسەر کەسانی داراو بۆرژوازەکانەوەو ڕێکخستنی داهاتو خەرجییەوە ئایەتەکانی نزیکەی (١٠) ئایەتن[٤].

هەموو ئەم یاسا وردو بەکەڵکو ناوازانە (خوێننامە) دەیکاتە هاوشانی هەندێ مەراسیمی خورافات، بەڕاستی ستەمێکی زۆر گەورەیە.

نوێبوونەوەو بەردەوامبوونی باوەڕ لەڕووی هۆشیاری ئاینییەوە.

زەردەشتی جگە لەوەی ئەم بابەتەی هەموو بەسەریەکدا شێواندووەو تۆڕێکی وەك تۆڕی جاڵجاڵۆکەی تەنیوەو ئەوەندە باسەکەی فراوانو تێکەڵ کردووە، کە سەر لەخوێنەر بشێوێنیو دەستو پێی خۆیسی لێون ببێت، بەڵام بەویستی خوا ڕەواندنەوەی تەمو مژەکان ئاسانەو تۆڕی جاڵجاڵۆکەش هەرچەندە جوانو مەحکەم دیارە بەڵام لاوازییەکەی لەکاتی دەست بۆ بردنیدا دەردەکەوێت.

---

[١] (النحل: ١١٢).

[٢] (المجادلة ١١).

[٣] (النساء: ١٣ ـ ١٤).

[٤] لەپەڕاوی (اصول الدين الاسلامي) ص ٣٥٢ ـ ٣٥٩. ت ـ ٤/ هەردوو دکتۆر رشدی محمد عليان، قحطان عبدالرحمن.

خوێنەری بەڕێز (زەردەشتی) ئەم بابەتەی لە لاپەڕە (٢٢٥)ەوە تا لاپەڕە (٢٤٦) کە کۆتایی کتێبەکەیە درێژەی پێداوەو ئەم وەڵامو سەرنجو تێبینیایانە بۆ هەندێکی زۆر پێویستە.

٤٦. لەلاپەڕە (٢٢٥)دا دەڵێت: "ئایین لەبەردەم ئەم قۆناغە نوێیەدا دەستەوسان دەبێت بەهۆی دابڕانی ئایینەوە، واتە بەهۆی مردنی پەیامبەرەوە پەیوەندییەکانی مرۆڤو خوا دەچڕێتو ئاینەکەش لەبەردەم پرسیارە نوێکاندا دۆش دادەمێنێ و بێدەنگ دەبێت.. هتد".

ئەم قسەیە ڕەنگە بەسەر ئایینەکانی تردا جێبەجێ ببێت لەکۆتایی هاتنی موعجیزەکانیدا، چونکە بەمردنی پەیامبەران موعجیزەکەیان کۆتایی پێدەهات وەك دار عەساکەی دەستی موسا (علیه السلام)، پاشایەتیو دەسەڵاتی سولەیمانو بەدەر لەزانستی پزیشکایەتی عیسا، بەڵام موعجیزەی موحەممەد پێغەمبەر ﷺ کە قورئانەو قورئانیش وەك چۆن لەپێشەوە باسمان کرد تا قیامەت پارێزراوە، چونکە خوا بەڵێنی پاراستنیداوە، ئەوەتا قورئان پەیوەندی نێوان پەروەردگارو خەڵکی پاراستووە بەکۆمەڵێك یاساو پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵو کۆمەڵو کۆمەڵێکی تری چەندەها ئەحکام پاراستووە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بمێنێ یان نەمێنێ چی لەمەسەلەکە دەگۆڕێ. خوا دەفەرموویێت: (..الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينا..). واتە: ئەمڕۆکە دینم بۆ کامڵ کردنو تەواوی نیعمەتی خۆمم ڕشت بەسەرتاندلو ڕازی بووم ئیسلام دینی ئێوە بێت.

ئەو پرسیارانە چییە کە ئایینی ئیسلام لەبەردەمیدا دۆش داماوەو وەڵامی پێ نییە بۆی؟! بۆ پرسیارەکانت نەنووسیوە؟!

٤٧. لەلاپەڕە (٢٢٦)دا دەڵێت: "ئایا ئایین لەنێوان چارەسەی گرفتە کۆنەکانو سەرهەڵدانی گرفتە نوێکانی مرۆڤ، لەکوێدا ئامادەیی هەیە؟ ئایا ئایین لەبەردەم نەکسەی باوەڕدا چی پێدەکرێتو چی دەهێنێت؟ وەڵامەکەی تەنها سێ ڕێگەیە.

یەکەم: یان ئەوەتا ئایین وەك هەموو ڕووداوێکی دیکە بچێتە لاپەڕەکانی مێژووەوە!!

دووەم: یان ئەوەتا فریادڕەسێکی دیکە، پەیامبەرێکی دیکە دەرکەوێتەوەو پەیوەندییەکان لەگەڵ خوادا دەست پێدەکاتەوەو جارێکی دیکە ئایینێکی نوێ سەرهەڵبدات.

سێیەم: یان ئەوەتا بەشێوەیەك لەشێوەکان لەگەڵ ئەقڵی سەردەمدا خۆی بگونجێنێتو وەڵامی پرسیارەکان بداتەوەو ئەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوە کە چەند ساڵێکە لەئەنجامی هۆشیاری کۆمەڵگاوە هاتوونەتە کایەوەو بەداهێنانێکی نوێوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکان بڕوانێت.. ت..و".

لێرەدا دیسان زەردەشتی باسی گرفتێکی نوێ دەکاتو ناڵێت وەك ئەو گرفتە، تا ئێمەش وەڵامی ئیسلامیی پێبدەین.

ئەو ڕێگایانەش باسی لێوە کردووە هیچییان ئایینی ئیسلام ناگرێتەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت (خوێننامە) کەباسی فریادڕەسێکی دیکە یان پێغەمبەرێکی دیکە دەکات. نموونە بە "مجتهد"ەکان دەهێنێتەوە، ئەوەی لەبیرچووە کە (مجتهد) ئیجتیهاد لە دەقەکانو بۆچوونەکاندا دەکاتو لەئایینی ئیسلام لایان نەداوەو بوونی ئەو موجتەهیدانە بەڵگەن لەسەر دەوڵەمەندیو گەورەیی ئیسلام، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئایینی ئیسلام لەگەڵ هەموو بارودۆخو سەردەمێکدا دەگونجێت.

فریادڕەسێکیتر یان پێغەمبەرێکیتر دەبوو جگە لەئیسلامیان بهێنایە. ئایینی ئیسلام عەقیدەیەو شەریعەتە، بەشی عەقیدەکەی چەسپاوەو نەگۆڕەو بەشی شەریعەتەکەی تەنها بە (عاقیدە) باسکراوەو نەخشاندنی ئەو قاعیدانە بەپێی سەردەم دەگۆڕێت، بەمەرجێك لەقاعیدەکان لانەدات.

بۆ نموونە قاعیدەی (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُم) کاروباری نێوان مرۆڤەکان بە (ڕاپرسی)یە، ئەم ڕاپرسییە وشەیەکی (مگاگی)یەو نەخشاندنی بەستراوە بەسەلیقەو پێویستیاتی سەردەمەوە.

کەسانێك هەستیان بەگونجاوی ئیسلام کردووە لەگەڵ هەموو سەردەمێکدا، کەسانی خەبیرن لەیاساو بوارە جیاجیاکانی ژیان! ئایینی ئیسلام خۆی فەرز کردووە لەڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا کە شوێنکەوتوانیشی زۆر لاوازن.

نەتەوە یەکگرتووەکان ئایینی ئیسلامی وەك سەرچاویەك لەسەرچاوەکانی قانوونی نێودەوڵەتی داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا قانوونی ڕووسی و ئەمریکی بەسەرچاوە دانەنراوە..

زانایانی قانوونی نێودەوڵەتی "بیانییەکان" دانیان ناوە بەشیاویی شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموو شوێن و کاتێك.

دکتۆر (أیزیکو انسابا توحین) کەزانایەکی یاساناسە دەڵێت: "ئایینی ئیسلام لەگەڵ پێویستییەکانی خەڵکیدایە، چونکە توانای گەشەسەندنی هەیە بێئەوەی بەرەو کز بڕوات و بەپارێزراویی و زیندوویی و شیاوی دەمێنێتەوە. ئایینی ئیسلام ڕیشەدارترین شەریعەتی پێشکەش کردووەو شەریعەتی ئیسلام بەرزترە لە شەریعەتە ئەورووپییەکان"[١].

هەروەها کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ بەراوردکردنی یاساکان کە لەساڵی (١٩٥٢)دا لە پاریس داوای کرد لەلایەنی پەیوەندیدار بۆ یاسا نێودەوڵەتییەکان کە بوار بدات ساڵی جارێك کۆنگرە ببەستێت بۆ فیقهی ئیسلامیی لەجیاتی بەستنی هەر دە ساڵ جارێك و هۆی ئەم داوا کارییەیان ئەوەبوو فێری ئەو سوودە زۆرانە بین لەشەریعەتی ئیسلامدا هەیەو ئەمەش دەقی داواکارییەکەیان بوو!!.

"لەبەرئەوەی ئەندامانی کۆنگرە بۆیان ڕوونبۆتەوە لەماوەی هەفتەی ڕابردوودا چەندە کەڵك وەردەگرن لەدیراسەکردنی فیقهی ئیسلامی و ئەو موناقەشەکردنە سەلماندی کە فیقهی ئیسلامیی لەسەر چەند بنەمایەکی زۆر بەنرخ دامەزراوەو گومان لەکەڵکەکانی ناکرێت و هەروەها جیاوازی ڕاکان لەم دەزگا یاساییە گەورەدا دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك لە ئوسوڵ و ڕای فیقهی کە ڕێگەی خۆشکردووە بۆ بەردەوام بوونی و وەڵامی هەموو داواکانی سەردەمی پێیە.

لەسەر ئەمانە ئەندامانی کۆنگرە ڕایدەگەیەنن کە ئارەزوو دەکەن هەفتەی فیقهی ئیسلامیی کارەکانی خۆی ساڵانە بێت"[٢].

شایەتی زانایان و کەسانی پەیوەندیدار بەیاساو شەریعەتەوە گرنگە یان کەسێکی وەك خاوەنی (خوێننامە)؟!

٤٨. لەلاپەڕە (٢٣٦)دا دەڵێت: "ئاستی فیکری و فەرهەنگی هەر ئایینێك دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی هۆشیاری شارستانییەتی ئەو کۆمەڵگایەی کە ئاینەکەی تێدا سەرهەڵدەدات، چەندێك لەبوارەکانی ژیاندا لەئاستێکی بەرزدا خۆی بنوێنێت هەر بەو پێوەرە ئاستی هۆشیاری ئەو ئەو کۆمەڵگایەی تێدا دەردەکەوێت کەئایینەکە تێیدا سەریهەڵداوە، هەر کۆمەڵگایەك چەندێك دابوو نەریت و کلتوور و ئەفسانەو فۆلکلۆر و فەرهەنگ و ئەدەبی کۆن بەسەریدا زاڵ بووبێت، هەر بەو پێوەرە هەموو بوارەکانی لەناو ئایینەکەدا ڕەنگی داوەتەوە، چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو ئایینەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی هەمان کێشە لەو کۆمەڵگایەدا.. ئایین لەڕووی موخاتەبەوە هەمیشە لەناو کۆمەڵگاکەی خۆیدا ژیاوەو نەیتوانیوە لێی دەربچێت، بەڵام کاتێك دەقەکانی ئاین وەك خۆیان بمێننەوەو هیچ گۆڕانکارییەکییان بەسەردا نەیەت (کە هەمیشە وابووە)، ورده ورده گەورەیی و بەرزی خۆی لەدەست دەدات.. ت..و".

پێش هەموو شتێك وەك لەپێشەوە باسمان کرد ئایینی ئیسلام بڕیارە چەسپاوەو نەگۆڕەکانی هەیەو هەروەها بواری شەریعەتیشی هەیە کە قابیلی گۆڕان و تەفسیری جیاجیایەو هەندێ کاروباریش هەیە، خوای گەورە لێی بێدەنگەو مرۆڤ ئازادە تیایدا.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "خوای فەرزەکانی لەسەر داناون زایەی مەکەن و سنوورەکانی دیاریکردووە مەیبەزێنن و هەندێ شتی قەدەغەکردووە نزیکی مەکەون و لەهەندێ شتیش بێدەنگە لەبەزەییەوە نەك لەبیرچوون بێت، وردی مەکەنەوە".

"عن أبي ثعلبة الخشني (رضى الله عنه) عن النبي ﷺ قال: ان الله فرض الفرائض فلا تضيعوها، وحد الحدود فلا تعتدوهان وحرم أشياء، فلا تنتهكوها وسكت عن اشياء رحمة لكم غير نيسان فى تبحثوا منها"[٣].

---

[١] لاپەڕە (١٣١)، پەڕاوی الايمان عبدالمجيد الزنداني.

[٢] لاپەڕە (١٣١)، پەڕاوی الايمان عبدالمجيد الزنداني.

[٣] جامع العلوم والحكم، لاپەڕە (١٥٠)، فەرموودەی ژمارە (٣٠).

هەروەها خوای گەورە لەگەڵ هەموو گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا کەسێکی ناردووە تەفسیری دەقە پیرۆزەکان بەشێوەیەکی هاوچەرخانە بکاتو دەقەکانیش هەمیشە لەنوێبوونەوەدان. ئەو موجتەهیدانەش کە (زەردەشتی) بەفرستادەو فریادرەس ناویان دەبات نموونەیەکن لەپیاوە تێگەیشتووە گەورانەی کە لە دیراسەی زۆری قورئانەوە بەرچاویان ڕۆشن بووەو لەسەر هەمان قاعیدەکانی ناو قورئان یاساکانی ژیان دەردەهێنن.

ئەمەش موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ کەپێش هاتنی ئەو موجتەهیدانە هەواڵی هاتنیانیداوە. عن ابي هوريرة ان النبي ﷺ قال: "ان الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مئة سنة من يجدد لها دينها". کەواتە ئەو قسەیەی (زەردەشتی) کە دەڵێت: "هەرواش بووە" لەلایەك ڕاست نییە، بەپێی ئەم بەڵگانەی سەرەوە لەلایەکی تریش پێچەوانەی باسەکەی تری خۆیەتی کە باسی بوونی "موجتەهید"ەکانی ئایینی ئیسلام دەکات.

لەوێشدا کە دەڵێت: "هەموو ئاینێك ڕەنگدانەوەی ناو کۆمەڵگەکەیەتی و لێی دەرناچێت"، ئەمە بەسەر ئایینی ئیسلامدا جێبەجێ نابێت، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەریدەخات کە ئایینی ئیسلام شتی تازەو نامۆ بەسەردەمو کۆمەڵگاکەی هێناوە، هەندێ لەگرژییەکانی خەڵکیش بەرانبەر بە ئیسلام لەسەرەتادا هۆکەی ئەو تازەکارییە بووە.

کاتێك هەردوو پیاوە بەناوبانگو قسەزانەکەی قورەیش ڕۆیشتن بۆ لای نەجاشی بۆ هێنانەوەی موسڵمانەکان.

بە پاشای حەبەشەیان وت: "ئەی پاشا هەندێ گەنجی سەر لێشێواو ڕوویان کردۆتەوە وڵاتەکەی تۆ، وازیان لەئایینی گەلەکەیان هێناوەو نەچوونەتە سەر ئایینەکەی تۆش، ئەوانە دینێکی تازەیان هێناوە، نەئێمە ئاشناین پێی نەتۆش، گەورە پیاوانی ناو عەشیرەتەکەیانو باوکەکانیانو مامەکانیان ئێمەیان ناردووە بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی بیاندەیتەوە دەستمان تەسلیمی کەسوکاریان بکەینەوە، چونکە ئەوان باشتر بەحاڵی ئەمانە ئاگادارنو ڕخنەو گرفتەکانیان ئەزانن".

نزیکەکانی لای پاشا نەجاشی وتیان: "ئەی پاشا ڕاست ئەکەن بیاندەرەوە دەستیان بابچنەوە ژێر ڕکێفی گەلو شاری خۆیان. بەڵام (نەجاشی) ڕازی نەبووت خۆی گوێ نەگرێت بۆیانو ناردی بەشوێنیانداو ئەوانیش هاتنو (جەعفەری کوڕی ئەو بو تالب)یان کردە دەم ڕاستی خۆیان.

نەجاشی لێی پرسین: ئەو شتە چییە ئێوەی بچڕاندووە لەگەلەکەتانو نەچوونەتە سەر هیچ دینێکی تریش؟!!

جەعفەر وتی: ئەی پادشا ئێمە گەلێکی نەفام بووین، بتمان دەپەرستو مردارەوەبوومان دەخواردو خراپەکاریمان دەکرد، خزمایەتیمان جێبەجێ نەدەکردو لەگەڵ هاوسێدا باش نەبووین، بەهێز لاوازی دەچەوساندەوە، ئێمە لەسەر ئەم حاڵەتە بووین تا خوای گەورە لەناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، بنەچەی ئەزانینو بێگومانین لەڕاستگۆیی‌و دەستپاکی، داوێنپاکی، بانگی کردین بۆ لای خوای تاکو تەنها هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەینو واز لەو بتانە بهێنین کە باوو باپیرانمان پەرستوویانە، فەرمانی پێکردین بەڕاستگۆیی لەکاتی قسەکردنداو بە بەجێگەیاندنی ئەمانەتو خراپە نەکردنو شایەتی ناهەق نەدان، فەرمانی پێکردین ماڵی هەتیو نەخۆینو تۆمەت بۆ ئافرەتی داوێنپاك دروست نەکەینو تەنها خوا بپەرستینو نوێژ بکەینو زەکات بدەین، ئێمەش باوەڕمان پێکردو شوێنیکەوتین، گەلەکەمان لەسەر ئەمە ئازاری زۆریان داین بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە سەر بت پەرستیو دەست بکەینەوە بەخراپەکاری، ئەوەندە دونیایان لێ تەسك کردینەوە هاتین بۆ وڵاتەکەی تۆو تۆمان هەڵبژارد لەناو هەموو خەڵکانی ترداو تکامان وایە لای تۆ ستەممان لێنەکرێت.

پاشان نەجاشی داوای لێکرد لەو قسانەی کە موحەممەد هێناویەتی کەمێکی بۆ بخوێنێتەوە. جەعفەریش سەرتای سورەتی (مەریەم)ی بۆ خوێندەوە، نەجاشی ئەوەندە فرمێسکی ڕشت تا ڕیشی تەڕبوو، نەك هەر نەجاشی (أساقفە)کانیشی فرمێسك بەچاویاندا هاتە خوارێ.

نەجاشی وتی: ئەم ئایینەی ئێوەو ئاینی عیسا لەیەك سەرچاوەوە هاتوون، بەعەمری کوڕی عاسو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعەی وت بڕۆن بەخوا هەرگیز تەسلیمی ئێوەیان ناکەم[1].

[1] الرحيق المختوم، ص ٩٢، لەهەموو پەڕاوەکانی (سيرە)دا هەیە.

لێرەشدا دەرکەوت کە لەئاستی فەرهەنگیو کلتوریو فکری کۆمەڵگاکەیدا نەبووە، بەڵکو لەناخەوە بۆ دەرەوەو بەپێچەوانەشەوە خەڵکی گۆڕیوە. لەئاستی سیاسەتو بەڕێوەبردنی شوێنکەوتووانیشدا ڕووداوێکی خۆشی نێوان ئەبو سوفیانی کوڕی حەربو (هرقل)ی گەورەی ڕۆمدا ڕوویدا، ئەویش دەگێڕینەوە، بۆ ئەوەی (زەردەشتی) بزانێت ئایینی ئیسلام وەك هیچ ئایینێکی تر پێناسە ناکرێت.

بوخاری لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب بۆی گێڕاوەتەوە: "کاتێك لە شام بووە بۆ بازرگانی، هەرقل ناردوویەتی بەشوێن خۆیو کۆمەڵێك لە قورەیشییەکان، کاتی ئەم ڕووداوە هاوکات بووە لەگەڵ ئەو ماوەیەی کە ئاشتی نێوان پێغەمبەر ﷺ قورەیشییەکان بەرقەرار بووە .

ئەبو سوفیان دەڵێت: هاتینە لای هەرقل کە چواردەوری پڕ بوو لە گەورە پیاوانی ڕۆمو ئێمەی بانگ کردو "مترجم"ە وەرگێڕەکەی خۆیشی بانگ کرد، وتی: کامیان بەخزمایەتی زیاتر دەگەنە ئەو پیاوەی دەڵێت: من پێغەمبەرم؟ ئەبو سوفیان وتی من.

هەرقل وتی: نزیکبەرەوە لەمن، هاوەڵانی لەپشتەوە بوون، وتی: ئەگەر لەوەڵامی هەر پرسیارێکدا کە من دەیکەم ئەگەر درۆی کرد پێم بڵێن.

ئەبو سوفیان دەڵێت: بەخوا لەترسی ئەوە نەبوایە بەدرۆم بخەنەوە درۆم دەکرد دەربارەی موحەممەد.

پاشان هەرقل پرسیاری کرد: بنەچەی موحەممەد چۆنە لەناوتاندا.

وتم: خاوەنی بنەماڵەیەکی بەشەرفو گەورەیە.

وتی: ئایا لەباپیرانیدا پاشا هەڵکەوتووە؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئایا زیاتر گەورە پیاوان شوێنی دەکەون یان چەوساوەو زەحمەتکێشەکان؟

وتم: چەوساوەو زەحمەتکێشەکان.

وتی: زیاد دەکەن یان بەرەو کەمی دەڕۆن؟

وتم: لەزیاد بووندان.

وتی: ئایا کەسیان پاشگەز دەبێتەوە بۆ ئایینەکەی پاش ئەوەی دەچنە دینەکەوە؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئایا ناپاکی "غدر" لێ دەوەشێتەوە؟

وتم: نەخێر، ئێستە ئێمە پەیمانی ئاشتیمان لەگەڵ مۆرکردووەو نازانین لەسەری دەڕوات یان نا، ئەبو سوفیان دەڵێت لەم دوو ووشە زیاترم نەتوانی خۆم بیخەمە پاڵی.

وتی: ئایا بەشەڕ هاتوون لەگەڵیدا؟

وتم: بەڵێ

وتی: دەرەنجامی شەڕەکان چۆن بووە؟

وتم: بەنۆرە بوون، جاری واهەبووە ئێمە سەرکەوتووینو جاری واش هەبووە ئەوان.

وتی: فەرمان بەچی دەکات؟

وتم: موحەممەد ئەڵێت" تەنها خوا بپەرستنو شەریکی بۆ دامەنێنو واز لەقسەی باوو باپیرانتان بهێننو فەرمان دەکات بەنوێژو ڕاستگۆییو پاکداوێنیو خزمایەتی.

هەرقل بەوەرگێڕەکەی وت، پێی بڵێ: پرسیاری بنەماڵەیم کرد وتت کە خاوەن بنەماڵەیە، پەیامبەرانی تریش وابوون، پرسیارم کرد ئایا کەسی تر وەك ئەمی وتووە، وتت نەخێر، منیش وتم ئەگەر کەسی تر ئەوەی وتبێت ئەوا لەوی وەرگرتووە، پرسیارم کرد، ئایا کەس لە باپیرانی پاشا بووە، وتت نەخێر، ئەگەر وابوایە ئەوا ئەموت داوای موڵکی

باووباپیرانی دەکات، پرسیارم کرد ئایا پێش ئەوە تۆمەتبارتان کردووە بەدرۆ، وتت نەخێر، وتم: کەسێك درۆ لەگەڵ خەڵکدا نەکات چۆن درۆ لەگەڵ خوادا دەکات.

پرسیارم کرد ئایا دەسەڵاتداران شوێنی دەکەون یان چەوساوەکان، وتت چەوساوەکان، دەی هەر ئەوانەش شوێن کەوتەی پێغەمبەرانن. پرسیارم کرد ئایا زیاد دەکەن یان کەم، وتت: زیاد دەکەن، ئیمان بەوشێوەیە تا تەواو دەبێت.

پرسیارم کرد ئایا کەس لەبەر ئاین پەشیمان دەبێتەوە، وتت نەخێر، باوەڕ بەوشێوەیە کە بەدڵدا ڕۆدەچێت، پرسیارم کرد کە فەرمان بەچی دەکات، وتت بە پەرستنی خوای تاكو تەنهاو نوێژو ڕاستگۆیی و داوێنپاکی، هەرقل وتی: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەق بێت ئەوا ئەم شوێن پێیانەی منیش دەبێتە موڵکی ئەو.

پاشان هەرقل وتی: من ئەمزانی ئەو پەیامبەرە دێت، بەڵام گومانم نەدەبرد لەناو ئێوەدا دەرچێت، ئەگەر بزانم تایبەت ئەبم بۆی ئەوا هەرچۆنێك بوایە خۆمم پێدەگەیاند، ئەگەر لەخزمەتیدا بوومایە پێکانیم ئەشۆرد "ئاوی دەستنوێژم ئەدا"، وتی: نامەکەیم بۆ بهێنن، کاتێك نامەکەی خوێندەوە دەنگە دەنگە دەنگو گاڵە گاڵ دروست بوو، ئێمەی کردە دەرەوە، کاتێك هاتینە دەرەوە وتم: موحەممەد کاری خۆی کرد، پاشاکانیش حسابی بۆ دەکەنو لێی دەترسن[1].

ئەبو سوفیان دەڵێت: پاش ئەو ڕووداوە بێگومان بووم کە پەیامبەرەو سەرکەوتوو دەبێت، ئەمانە لە دڵمدا بوو تا خوای گەورە هیدایەتی دامو موسڵمان بووم.

لێرەشدا دەرکەوت کە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگاکەی نەبووە لەهیچ لایەکەوەو پاشاکانی ئەو سەردەمەش ئەمەیان زانیوەو گومانیان نەبردووە لەکۆمەڵگایەکی بەو شێوەیەدا دەربکەوێتو ئەوەیشی خەڵکی بۆ بانگ کردووە لەبەرزترین ئاستی سیاسیی و کۆمەلایەتی و بەڕێوەبردندا بووە.

ئەوانە بەڵگەی ڕاستن لەسەر گەورەیی و ڕاستیی ئایینی ئیسلامو بەگژاچوونی کۆمەڵگەی دواکەوتووی ئەوکاتەو هێنانی بۆ تەعالیمە تازە ناوازەکان، (زەردەشتی) تەنها قسەی خۆی دەکات بەبێ بەڵگەو بەبێئەوەی (مەنتقیی و واقعی)یش بێت.

٤٩. لەلاپەڕە (٢٣٩)دا دەڵێت: "ئایین کە هەمیشە لە خزمەت چینە باڵاکاندا بووە، ئاواتو ئامانجی چینە چەوساوەکان خرانە تابووتەوەو ئەگەر لەسەرەتادا دژایەتییەکی گەورەی دەرکەوتنی ئیسلامو پەیامبەرەکەی کرابێت هەر زۆر زوو بەدیوەکەی تریدا شکایەوەو هاندەرێکی زۆری بۆ پەیدابوو. ئەمەش لەڕووی باوەڕەوە نەبووە..! بەڵکو لەتێگەیشتنی ئەقڵی ئابووری کۆمەڵگاکەوە بوو، چونکە هەر لەگەڵ زانیان ئیسلام لەبەرژەوەندی چینی ئەرستۆقراتی خۆیاندا نییەو هیچ مەترسییەکی بۆ دروست ناکاتو بگرە سوودی زیاتری لێ دەبینن، پشتیان گرتو تێیدا مانەوە.. ت..و".

بەڕاستی جێگەی ئەسەف و خەفەتە کتێبی لەم شێوە کە هیچ نرخێکی عیلمیی نییە بڵاو بکرێتەوە، یان لەسەرەتا تاکۆتایی بەئەندازەی تروسکاییەك هەقی تێدا نەنووسرابێت، هەموویشی قسەی بێ بەڵگەو هەڵبەستراو بێت.

سەیرکە خوێنەر، دەڵێت: "ئاواتو ئامانجی چینە چەوساوەکان خرانە تابووتەوە. ئەمە لەکوێو چۆن باسی ناکات.

ئەگەر وایە بۆ "بیلال، عەممار، صهیب، زەیدو زەنیرەو چەندانی تر" ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر خزمەتی ئایینیان دەکردو ڕیواتە سەحیحەکەی بوخاریش "واتە موناقەشەکەی نێوان هرقلو ئەبو سوفیان"یش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە چەوساوەو زەحمەتکێشەکان زیاتر بەرژەوەندی خۆیانیان تێدا دەبینییەوە، هەرچەندە ئایینی ئیسلام دادوەریی تەواوی تێدایەو کەسانی دەوڵەمەندو دەسەڵاتداریشی پشتگوێ نەخستووەو ئەوانیش ئەگەر ورد بن بەرژەوەندی خۆیانی تێدا دەبینن.

سورەتی "عبس" شایەتە لەسەر ئەوەی چینی چەوساوەو کەمئەندامانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلام مافیان پارێزراوە[2].

ئایەتی: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾ (الكهف: ٢٨)[1].

---

[1] الرحيق المختوم، ص ٩٢، لەهەموو پەراوەکانی (سیره)دا هەیە.

[2] سەیری تەفسیری سورەتی (عبس) بکەو بزانە هۆی دابەزینەکەی چی بووە ئەو کاتە دەزانیت ئایینی ئیسلام چۆنە لەگەڵ مافخوراوانو کەسانی سادەدا، بەراوردێك بکە.

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەبوو دەسەڵاتدارانی قورەیش‌و چینی ئەرستۆقراتی داوای ئەوەیان کرد کە پەیامبەر ﷺ مەجلیسیان بۆ جیا بکاتەوەو کاتێك ئەمان گوێی بۆ دەگرن با کۆیلەو هەژارو نەدارەکان لە مەجلیسەکەدا ئامادە نەبن، بەڵام خوای گەورە ئەوەی ڕەتکردەوەو بە پەیامبەری ﷺ فەرموو: "ئارام بگرە لەگەڵ ئەو هەژارانەدا، تەنها خوایان دەوێت‌و گوێڕایەڵی لە بێ ئاگایان لەیادی خوا مەکە".

ئەبوبەکری سدیق تەنها خۆی لە سەرەتای بانگەوازدا ژمارەیەکی زۆری لە کۆیلەکان بەپارەی خۆی دەکڕیەوەو ڕزگاری دەکرد، ئەگەر ئەم کارە بەگەورە نەزانێت بۆ دەیکات؟!

ئایەتی (موکاتەبە)ی سورەتی نوور، کە ڕێگە خۆش دەکات بۆ ڕزگارکردنی بەندەکان‌و کەفارەتی هەندێ سوێند کە بەندە ڕزگارکردنەو بەدەستهێنانی پاداشتی گەورە هەر کۆیلە ڕزگار کردنە، ئەمانە ئامانجی چەوساوەی خستە تابووتەوە؟؟ ئایا شەرم نەیگرتیت ئەوەت نووسی؟؟ فەرزکردنی زەکات هاندان بۆ بەخشین‌و منەت نەکردن لەکاتی بەخشیندا لەبەرژەوەندی کێیە؟؟!

کەسێکی قولەڕەشی بێکەسی چەوساوەی وەك بیلال (ڕەزای خوای لێبێت) ئەبوبەکر ئازادی دەکات‌و دەبێتە بانگوێژو هاوەڵی پەیامبەر ﷺ و هاوشان لەگەڵ گەروە پیاواندا دەبێت‌و هەست بەجیاوازی ناکات‌و لەوەش زیاتر بەشانی کەعبەدا سەردەکەوێت‌و بانگی لەسەردەدات‌و هەموو ڕۆژێك کە بانگ بدرێت، باسی چۆنێتی دامەزراندنی بانگ‌و مەدینەی پێغەمبەر ﷺ بکرێت، باسی بیلال بەڕێزەوە دەکرێت‌و لەو ساڵەوە تا ئێستەش باسی بەگەورەیی‌و چاکە دەکرێت‌و ناوبانگی زیاترو زیاتر دەبێت. یان ئوسامەی کوڕی زەید کە باوکی کۆیلە بوو پەیامبەر ﷺ ڕزگاری کرد، ئەم ئوسامە دەبێتە سەرکردەی سوپایەك کە عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان‌و عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوایان لێبێت)ی تێدایەو کاتێك ئەبوبەکری سدیق پێویستی بە (عومەر) دەبێت مۆڵەت لە ئوسامە دەخوازێت کە مۆڵەتی (عومەر) بدات[2].

نەرمی‌و بەسۆزی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەڵکی سادەدا ئەوەندە زۆر بوو بەپێی فەرموودەی صەحیح ئەگەر پیرەژنێك چەندێك لەوەختی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺی بویستایە درێغی نەدەکردو گوێی بۆ دەگرت‌و داواکانیشی بۆ جێبەجێ دەکرد.

من نازانم چەند نموونە بهێنمەوەو چی بڵێم کە مێژووی ئیسلام‌و قورئان پڕن لە نموونە بۆ بەدرۆخستنەوەی بوهتانەکەی (زەردەشتی). خوای گەورە دەفەرموێت: (وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ) (القصص: ٥).

ئێمە دەمانەوێت منەت بکەین بەسەر ئەو کەسانەی کە لەزەویدا دەچەوسێنرێنەوە بیانکەینە ڕێبەرو پێشەواو میراتگر.

کەواتە خواو ئایینەکەی‌و پەیامبەرەکەی ﷺ لەگەڵ چینی چەوساوەدان تا مافەکانیان بۆ دابین دەکەن.

**٥٠.** لەلاپەڕە (٢٣٩)دا دەڵێت: "حەج لەپێناوی مانەوەو ڕاگرتنی نەریتێکی عەرەب هاتە ئاراوە، کەسوودێکی زۆری هەبووەو ئەرستۆکراتەکانی عەرەب لەبەر زۆری دەستەکەوتەکانی نەیانتوانیوە دەستی لێ هەڵبگرن، هەروەها (المؤلفة قلوبهم) دڵڕاگرتن‌و پڕکردنی باخەڵی سەرمایەداران نەبێت چی دیکە نەبوو، بەو بەڵگەیەی پاش گەیشتن بە دەسەڵات‌و پەیداکردنی هێز عومەری کوڕی خەتاب ئەو حوکمەی قورئانی هەڵگرت‌و وتی: ئێستا ئیسلام پێویستی بەوان نییە، هێزو دارایی خۆی هەیە یان ئەوەتا موسڵمان دەبن یان شمشێر لەنێوانماندایە.. ت..و".

١. حەج کردن نەریتێکی عەرەب نییەو فەرمانێکی خواییە بۆ بەندە دەست ڕۆیشتووی خاوەن داراییەکان" (..وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً..)، وشەی "الناس" بۆ هەموو خەڵکییە بەهەموو جۆرەکانی ڕەنگ‌و زمانەوە.

جگە لەمانەش یەکەم بنیاتنەری ماڵی (کعبە) ئیبراهیم‌و ئیسماعیل پێغەمبەر بوون (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، کە ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەکوردستانی باشوورەوە دەرکەوتووەو ناوەکەیشی دیارە کە عەرەب نەبووە.

---

[1] سەیری تەفسیری ئایەتەکە بکە لەسورەتی "الکهف"دا.

[2] سەیری هەرکتێبێکی سیرە بکەیت، ئەم ڕووداوانەی تێدایە.

٢. بۆ بەرژەوەندی ئەرستۆكراتەكان نییە، بەڵكو فەرزە لەسەر موسڵمانی بەتوانا كە حەج بكەن‌و پارەو خەرجی بدەن بۆ حەج كردن‌و مانەوەی "حەج"یش بەستراوە بە شەوق‌و ئارەزووری زۆری ئیمانداران بۆ بینینی ماڵی خواو بەدەستهێنانی پاداشت، ئەگینا كێ زۆریان لێدەكات كە پێشبڕكێ دەكەن؟ هەرزوو ناو تۆمار دەكەن‌و ڕۆژی دەرچوونی ناوەكانیان بۆ حەج بەخۆشترین ڕۆژانی ژیانیان دایدەنێن‌و ڕۆژی گەڕانەوەشی لە حەج ئاواتی حەجێكی تر دەخوازن.

كەسێكی وەك (نالی شاعیر) كە حەج دەكات‌و ئەو هەموو ماندووبوون‌و گەرماو ئاوی سوێرخواردن‌و دڕك‌و داڵە دەبینی، چونكە وەك ئێستە خزمەتگوزاری زۆر نەبوون، لە ززەت لەو ناڕەحەتی‌و ماندووبوونانە دەچێژێ‌و لە شیعرێكی درێژدا باس لەخۆشییەكانی دەكات كە ئەمە نموونەیەكی هۆنراوەكەیەتی:

شوتور بانا! ئەمە پەرژینی باغی ڕەوچەیە، یاخۆ

عەرارو عەر عەر و بانی خیابانی بیابانە

ئەسیری سیلسیلەی بەندی مەهاری سەرقەتارت بم

كە دەمكێشێتە ڕەوچەی حەی، وەكو مەجنونی دیوانە

چ ڕەوچە؟ ڕەوچەیی جەننەت! چ جەننەت؟ جەننەتی قوربەت!

چ قوربەت؟ قوربەتی ڕاحەت! چ ڕاحەت ڕاحەتی جانە!

مەقام‌و زەمزەمەی حادتی لەشەوقی كەعبەوو حوجرەی

مەقام‌و زەمزەم، وا ئوشتری هێنایە حۆلانە

صەریری جونبوشی تەخت‌و مەحەففەی مەخمەڵیی سەوزی

دەڵێ تەسبیحی مورغانە، لەسەر تەختی سولەیمانە

كەژاوەو دارو بارو تەختەیی لوختەی لەسەر بوختی

دەناڵێنن لەشەوقی گەیبە وەك ئەستونی حەننانە

چ نورێكە، لەنێو فانۆسی بەرگی كەعبەدا، ڤاهیر

دەكێشی خەلق، باگێن ئیمتپالی ئەمری یەزدانە؟!

چ جەژبە؟ جەژبەتی چەوئی لە قندیلی حەرەمدا، وا

دەبێ ئینسان لە گەوافیدا بسووتێ میپلی پەروانە[1].

٣. حەجكردن ڕەمزە بۆ یەكگرتوویی‌و یەكبوونی ئوممەتی ئیسلامی ڕەمزی برایەتی‌و خۆشەویستی هەموو تاكەكانی مرۆڤایەتییە بەبێ حیسابكردن بۆ جۆری زەمان‌و ڕەنگی پێست‌و ڕەمزی یەكسانی گەلانە لەبەردەم خوادا، ڕەمزە بۆ فیداكاری‌و بەخشینی ماڵ.

هەروەها مرۆڤەكان فێردەكات گەلان هەمووی برای یەكن‌و تەنها دوژمنیان شەیتانە، لەگەڵ هەڵخەڵەتاوان بەشەیتان. ئەمانەو جگە لەمانە پیادەكردنی مەناسكەكانی حەج دەردەكەوێت.

٤. بۆ مەسەلەی (المؤلفة قلوبهم) بەو شێوەیە نییە كە (زەردەشتی) دەڵێت: باخەڵ پڕكردنی سەرمایەداران نەبوو، بەڵكو سیاسەتێكی حەكیمانەو بیرۆكەیەكی دەوڵەتیانە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەحی خوایی جێبەجێی دەكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەكاتی دامەزراوی‌و بەهێزی‌و دەوڵەمەندی دەوڵەتە ئیسلامییەكەیدا ئەمەی دەكردو دەرماڵەی بۆ هەندێ كە دەبڕییەوە، لەبەرئەوەی یان دەم ڕاست‌و گەورە پیاوبوو بۆ دیوەخانەكەی پێویستی بەو دەرماڵەیە هەبوو یان سەركردەیەكی دوژمنەو لێقەوماوەو پێویستە ڕێزی لێبگیرێ‌و سوكایەتی پێنەكرێ، یان كەسێكی زۆربڵێ‌و ئاژاوە چییەو زمانی بەو درەماڵەیە دەبەسترێ، یان لەناو مرۆڤەكاندا هەیە تا باخەڵی پڕ نەبێت‌و سكی تێر نەبێت ناتوانێت دڵی‌و مێشكی بكاتەوە بۆ ڕاستییەكان.

[1] دیوانی نالی، ص ٤٩٦ ـ ٥٠١، بۆ خۆشبردن لە هۆنراوەكە شەرحەكەی بخوێنەرەوە.

ئەگەر سەيرى ئەو كەسانە بكەين كە پێغەمبەر ﷺ موچەى بێبەرامبەرى پێداون، يەكێك لەو كەسايەتييانەن كە لەسەرەوە باسمان كرد.

ئيمامى عومەريش حوكمى ئايەتەكەى لانەبردووە، بەڵكو هۆكارى دانانى موچەكە نەمابوو، ئيتر چ پێويست بەمانى موچەكە دەكات‌و ئشەو ئايەتە لەكات‌و شوێنى خۆيدا هەر كارى پێدەكرێت.

ئەگەر سياسەتمەدارانى ئەمڕۆ پاش چەندەها ساڵ لە تەجروبەى حوكمڕانى ئەم كارە بكەن‌و سامان برێژن بۆ ڕاگيركردنى دڵى خەڵكى‌و عەيبيش نەبێت‌و بەزيرەكى‌و لێهاتووى دابنرێت، ئەى بۆ بۆ ئايينى ئيسلام گەورەيى‌و شانازى نەبێت كە لەمەشدا دەستپێشخەرى هەبووە.

خۆ ئەگەر سياسەتمەدارانى ئەمڕۆ وەڵامێكى گونجاوو ئارام بەخشيان نييە بۆ فيداكاران‌و ماندووان‌و هاوكارانى ڕۆژى سەخت‌و تەنگانەيان ئايينى ئيسلام‌و ئەو وەڵامەشى پێيە، هەموو شوێن كەوتووانى‌و پياوانى ڕۆژى تەنگانەش بەو پەڕى لێبوردەيى‌و شادييەوە ڕازى دەكات، هەروەك چۆن پەيامبەر ﷺ لەيەكەم دابەشكردنى ماڵ‌و سامان بەسەر كۆمەڵەى (المؤلفة قلوبهم)دا هاوەڵانى خۆى دواندو ڕازى كردن لەبەر گرنگى ڕووداوەكە لێرەدا باسى دەكەم:

كاتێك پەيامبەرى خوا ﷺ ئەو ماڵ‌و سامانە زۆرەى ڕشت بەسەر ئەو كۆمەڵەداو بەشى هاوەڵانى خۆى كەمتردا هەندێ لەهاوەڵانى دڵيان عاجز بوو، لەنێوان خۆياندا ئەيانووت: "ئێمەى لەبير چوويەوە"، سەعدى كوڕى عوبادەش ئەم دەنگ‌و باسەى گەياندە پەيامبەر ﷺ، پەيامبەريش ﷺ هات بۆلايان‌و بەمشێوەيە گفتوگۆيان دەست پێكرد:

پێغەمبەر ﷺ: ئەى كۆمەڵى ئەنسار پێم گەيشتووە لە دڵتاندا گلەيى هەيە؟ ئايا كە من هاتم بۆ لاتان سەر لێشێواو گومڕا نەبوون، خوا هيدايەتى دان‌و هەژار بوون خوا دەوڵەمەندى كردن؟ ناكۆكى‌و دوژمنى يەكتر بوون خواى گەورە دڵەكانتانى كردەيەك؟

ئەنسار: بەڵێ وابوو! خواو پێغەمبەرەكەى ﷺ خاوەنى منەت‌و فەزڵن.

پێغەمبەر ﷺ: ئەى كۆمەڵى ئەنسار بۆ وەڵامم نادەنەوە؟

ئەنسار: چى بڵێين ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ؟ هەر خواو پێغەمبەرەكەى ﷺ خاوەنى فەزڵ‌و منەتن.

پێغەمبەر ﷺ: بەخوا ئەگەر بتانەوێت ئەتوانن بڵێن‌و حەقيشتانەو ڕاستيش دەكەن، ئەگەر بڵێن: تۆش هاتيت بۆ لامان باوەڕمان پێ كرديت‌و خەڵكى دوژمنايەتيان دەكردى ئێمە بووينە پشتيوانت‌و خەڵكى دەريان كرديت ئێمە داڵدەمان دايت. ئەى ئەنسار" بۆ شتێكى كەمى دونيايى گلەيتان لا دروست بووە كە دڵى خەڵكانێكم پێ ڕاگيركردووە كە موسڵمان بن‌و ئێوەم داوەتە دەستى ئيسلامەتييەكەتان! ئايا ڕازى نابن خەڵكى بە حوشترو مەڕو ماڵاتەوە بگەڕێتەوەو ئێوە بەپێغەمبەرى خواوە ﷺ بگەڕێنەوە، بەو كەسەى نەفسى منى بەدەستە ئەگەر هيجرەت نەبووايە من ئەنسارييى دەبووم، ئەگەر هەموو خەڵكى ڕێگەيەك بگرنە بەرو ئەنسار بەتەنيا ڕێگەيەك بگرێتەبەر، من لەسەر ڕێگەكەى ئەنسار دەبم. خوا ڕەحم بە ئەنسار بكە، ڕەحم بە منداڵ‌و نەوەى ئەنسار بكە[1].

خوێنەرى بەڕێزو كاكى نووسەر: لێرەشدا ڕوون بوويەوە كە حەج‌و (المؤلفة قلوبهم) لەبەرژەوەندى هەموو خەڵكەو چەندەها بەهاى مرۆڤايەتى تێدايە، وەك لەپێشەوە ڕوونمانكردەوە.

٥١. (خوێننامە) لەلاپەڕەكانى كۆتاييدا هەر بەتەواوى تێكيدەدات، باسەكەى باسى باوەڕە كەچى باسى مەزهەبە فيقهييەكان‌و دەسەڵات دەكات‌و پرسيار دەكات‌و دەڵێت: "ئايا باوەڕدارێك دەتوانێت بەهيچ يەكێك لەو مەزهەبانە ڕازى نەبێت‌و باوەڕ تەنها لەوەدا ببينێتەوە كە پەيوەندييەكى ڕۆحى نێوان خۆى‌و خوايە؟!"[2].

---

[1] حياة محمد/ محمد حسين هيكل، ص ٤٣٨و سەيرى پەڕاوە فيقهييەكانى وەك (فقه السنه)ش بكە بۆ درێژەى باسى (المؤلفة قلوبهم).

[2] خوێننامە، لاپەڕە ٢٤٣.

پاشان کەمێکی تر باس لە خەلیفەکانو هەڵبژاردنیان بۆ مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەتی دەکاتو پاش ئەمانەش دەگاتە چەند دەرەنجامێك، لەوانە" دەڵێت: "دەکرێت بڵێین کە مەزهەبەکان ئەوەندەی کلتووری سیاسییو مەنهەجێکی ماددیی دەسەڵاتە، ئەوەندە پەیوەندی بەڕۆحی ئایینو فەلسەفەکانی میتافیزیكو باوەڕەوە نییە"[1].

دەڵێت: "مەزهەب بووەتە هۆکارێك کە بێئەوان ئاینزاد نەتوانێ ڕاڤەی دەقەکانو سەرچاوە سەرەکییەکانی ئایین بکات"[2].

(زەردەشتی) وا کتێبەکەی تەواو بوو، پاش گەڕانی بەو سەرچاوانەشدا هێشتا حاڵی نەبووە لە باوەڕو مەزهەبی فیقهیو جیاوازیان نازانێت.

باوەڕ، (عقیدە) پەیوەندی نێوان بەندەو خوایە، بەچەند ئەحکامێك لەپێشەوە بامان کرد.

ئەو مەزهەبانەش کە (زەردەشتی) ناویان دەباتو دەڵێت: "بەخت یاوەریان بووە"، وەك مەزهەبی "حەنەفیو شافیعیو مالکیو حەنبەلی"، ئەوانە مەزهەبی فیقهینو باس لە ئەحکامی عەمەلی دەکەن، لێرەشدا (زەردەشتی) دەڵێت: "مەزهەبەکان کلتووری سیاسیو مەنهەجێکی ماددی دەسەڵاتە". ناحەقی نییە، چونکە باسێك لەباسەکانی ئەحکامی عەمەلی باس لە چۆنێتی دەسەڵاتو حوکمانی دەکاتو مەزهەبەکان هەریەکەیان بۆچوونێی خۆیانیان هەیەو بۆچوونەکانیشیان قبوڵی موناقەشە دەکەنو خەڵکیش لەبەردەم ئەو مەزهەبانەدا سێ جۆرن:

١. موجتەهید: ئەمانە کەسانێکی زاناو شارەزان کە خۆیان ڕاستەوخۆ لەدەقەکانی قورئانو فەرموودەوە حوکم وەردەگرن، ئەمانە مەرجو سیفاتی تایبەتییان هەیە.

٢. شوێنکەوتووان، "متبع": ئەمانە کەسانی خوێندەوارو ئاگادارن بەسەر حوکمو بەڵگەی حوکمەکانداو هەرچی بکەن دەزانن بەڵگەی کردەوەکەیان کامەیەوو لەسەر چاو ڕۆشنی لە مەزهەبەکان وەردەگرن.

٣. لاساییکەرەوە: "مقلد" ئەوانەن کە نەخوێندەوارن یان وەك نەخوێندەوارو نەشارەزا وان، ئەوانە هیچیان پێناکرێت لاساییکردنەوە نەبێتو چاریان نییە دەبێت مقلد بن.

مەزهەبی ڕاستو دروستیش ئەوەیە بەڵگەو سەنەدی حوکمەکەی دەقی قورئان، یان فەرموودەی سەحیح بێتو هەموو سەر مەزهەبەکانیش (خوایان لیّ ڕازی بێت) وتوویانە "اذا صح الحدیث فهو مذهبي"[3]. واتە: "ئەگەر فەرموودەکە ڕاست دەرچوو[4] ئەوە مەزهەبی منە".

کەواتە خوای گەورە زۆر ڕێزی لەژیری مرۆڤەکان گرتووە کە لەپەیوەندی نێوان خۆیاندا قسەیان هەبێتو ئیجتیهاد بکەن بۆ ژیانی دونیاییو خۆیان، بەمەرجێك سنوورەکانی خوا نەبەزێننو لەدائیرەی دینداری دەرنەچن.

خوا کە (عالم الغیب)ە دەزانێت ژیان دەگۆڕێتو پێداویستییەکانی ژیان هەمیشە لە گۆڕاندایە، بۆیە ئەحکامەکانی ژیانی ماددی بەشێوەیەك داڕشتووە وەك لاستیك توانای کشانی هەبێتو وەڵامی داخوازییەکانی هەموو سەردەمێك بداتەوە.

---

[1] خوێننامە، لاپەڕە ٢٤٦.

[2] خوێننامە، لاپەڕە ٢٤٦.

[3] بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری کتێبی "الآیات البنیات" ئالوسی بکە بەشەرحی (البانی).

[4] "ڕاست دەرچوو" واتە لەمیزانی یاساکانی فەرموودەدا، چونکە تا ئەوکاتە فەرموودەکان پۆلێن نەکرابوون.